سالّی حەوتەم

80

شوباتی ٢٠١٥

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا!

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

هەموو تەمەن، بۆ خۆشەویستی نەک تەنها ڕۆژێک، بۆ ناشیرینکردنی!

کامیان بەنرخترە: دەرزی، یان مقەست؟!

بەگوڵاوی وشەکانت، مرۆڤ دروست بکە!



گەیشتن بە تۆ



ئادابە کۆمەڵایەتییەکان



بازاڕسازی بەستایش



لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

# گوتنو زانینی ئەوەی کە خودا تاكو تەنهایە، چ سودێکی هەیە؛ کە تۆ ڕۆژانە لەبەردەم هەزاران بتدا، کڕنووش بەریت؟!

سائب تەبریزی



No: 80


خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:
مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگـەرد فــارس
زاهیــر زانــا
محەممەد مێرگەیی
محمد هاشم محمد
وەهـاب حەسـیب
یەحیـا محەممەد
گوڵان حەمەئەمین

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر:- ئازاد محێدین

بەشی هونەری و دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کلسوم جەلال



ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com




bryarmagazine


دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
07708649210

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد


نرخ 2500 دینار




# ئەگەر بتەوێ، هەموو ئاواتەکانت دێنیتە دی!

ئەگەر ئێستا، لە حاڵەتێکی ئاساییدا دەژیو بیروهۆشت بە شتی بێسوودو ترس لە داهاتوو، ڕووداوی کتوپڕەوە، سەرقاڵ نەکردووە، ئەوە تۆ لە باشترین ساتەکانی ژیانتدای.

ئەگەر ڕۆژانە، لەگەڵ خەونەکانی خۆتدا گفتوگۆ دەکەیتو ناهێڵی کەس سنوور بۆ حەزو ئاواتەکانت دابنێو هەرگیز دەستبەرداریان نابیو پێت وایە جگە لە خۆت، کەس ناتوانێ سنوور بۆ تواناکانت دابنێ.......

ئەوە تۆ کەسێکی زۆر سەرکەوتووی لە ژیانتدا! دەزانی چۆن بژیو چۆن ئاسایشی دڵو دەروونو بیروهۆشو بەختەوەری خۆت بپارێزی!

ئەو کاتەی، کە قەناعەتت وایە؛ مرۆڤەکان ناتوانن دەسکاری قەدەری تۆ بکەنو هەڕەشە لە خەونو ئاواتو خۆزگەکانت بکەنو مێشکی خۆتیان پێوە خەریك ناکەی، تۆ بەهێزترین کەسی دونیای!

ڕۆژانە مەهێڵە بیروبۆچوونی نەرێنیو ڕاڕایی، نیگەرانت بکەن، بۆ لەخۆڕا خۆت دەهاویتە نێو چاڵی نیگەرانیو دڵەڕاوکێ؟

ئەوە تەنها خەیاڵی خۆتە وات لێدەکات؛ نیگەرانبی!

لەگەڵ گۆڕینی بۆچوونەکانت بۆ بۆچوونی ئەرێنیو شادیبەخش، هەمووی دەڕەوێتەوە.

دەزانی پێش (٣٠٠)ساڵ وشەی "بیرۆکە" لە زمانی ئینگلیزیدا بە مانای "نیگەرانی" بەکارهاتووە، چونکە هەمیشە ئێمە نیگەرانی ئەو ڕووداوانەین، کە بە بیرکردنەوەی خۆمان درووستمان کردوونو پێشبینیان دەکەین، کە بە داخەوە زۆربەمان چاوەڕوانی ڕووداوگەلێکی ناخۆشینو ڕۆژانە ژیانی خۆمانی پێ تاڵ دەکەین، لە کاتێکدا خۆشبەختانە لە ٩٠٪ی ئەو شتانەی، کە تووشی نیگەرانیو دڵەڕاوکێمان دەکەن هەر وجودیان نییەو نایەنەدی!

کەواتە: ئەگەر تا ئێستا زەینت پڕە لە هەستی ناخۆشو ڕووداوی چاوەڕوان نەکراوو ترس لە دەوروبەرو مەحاڵبوونی بەدیهاتنی ئاواتەکانت، لێرەدا هەڵوێستەیەك بکە، بوەستە، لە جێگای خۆت مەجووڵێ، تا مێشکت لەم جۆرە بۆچوونانە پاك دەکەیتەوە!

بە شێوەیەك وەکو زانایەك دەڵێ: چۆن بە گسکێکی کارەبایی، تۆڕی جاڵجاڵۆکە ڕادەماڵی، ئاوا هەموو ئەو تۆڕە جاڵجاڵۆکانە ڕاماڵە، کە مێشکو ویستو ئیرادەو حەزو ئارەزوویان تەنیوی!

سێ سەدە پێش زایین، واتە ٢٣١٥ ساڵ پێش ئێستا، قوتابیەکی سوقرات دەڵێ: ئەو کەسە بەختەوەرە، کە بەختەوەری خۆی لە دەستی خۆیدایە!!

تۆڵستۆی نووسەری بەناوبانگی ڕووسیش دەڵێ: ئەگەر دەتەوێت بەختەوەر بیت، ببە!

ئیدی ئەمە بڕیاری خۆتە، بۆ کەسانێکی دی دەکەیتە ڕێگر لە بەرامبەر بەختەوەریتدا؟

وەرزشەوانێکی جیهانی دەڵێت: کەس تووشی ئازار نابێ، ئەوە عەقڵی خۆمانە، ئازارمان دەدات!

پێدەچێ ئەو وتەیە تاڕادەیەکی زۆر ڕاستبێو لە ژیانی زۆربەماندا ڕەنگدانەوەی هەبێ!

کەواتە: با ژیانێکی سادەو ڕوون بژین وەك ئاو ڕوون! بێ ئاڵۆزیو قورسکردنی کارەکان، با چیدی ئەوەندە بە ئاڵۆزی نەڕوانین بۆ شتەکانو هەزارو یەك لێکدانەوە بۆ شتێك نەکەین، کە ئەوە ناهێنێ!

با وەکو منداڵ، شەوانە دوای چینێ خەوی خۆش، هەموو ئازارو نارەحەتیو کێشەکانمان لە بیربەرینەوە!

با بە تووڕەبوونو نیگەرانیو پاڵەپەستۆی دەروونی، ڕۆحو جەستەمان ژەهرخوارد نەکەین!

با ئاگاداربین: بە لاشەیەکی شەکەتو ڕۆحێکی ماندووەوە، ناتوانین بگەینە خەونەکانمان!

شکسپیر دەڵێ: ئێمە لەو قوماشە درووست کراوین، کە خەونەکانمانی پێ چنراوە!

ئێمە بەو خەونانەوە، هەست بە خۆشیی ژیانو تامی زیندەگی دەکەین، با بە دەستی خۆمان، لە زیندانی بیروبۆچوونی تاریکدا، خۆمان زیندان نەکەین.

با هەمیشە یاری بۆچوونی جوانو هیوابەخشبینو سۆمای چاومان لە ئاسۆیەکی ڕوون بێ. مێشکو دەروونمان ناتوانن لە یەك کاتدا، پێشوازی لە بۆچوونی ئەرێنیو نەرێنی بکەن، لەو نێوانەدا پەرشو بڵاودەبنو هەرەس دێنن.

دەزانم ئازیزم: گرفتت هەن، کێشەت دێنەڕێ، ئەمە شتێکی ئاساییە، بەڵام پێویستە بزانی؛، کە گرفتەکان گرفت نین، بەڵکو ڕاهاتنی تۆ لەگەڵ گرفتەکانداو هەوڵنەدان بۆ ڕزگاربوون لێیان گرفتە!

لە کۆتاییدا پێت دەڵێم: سەرەتا ئەو کارانە بکە، کە زۆر زەروورن، پاشان ئەو کارانە بکە، کە دەکرێ بیانکەیو مومکینە پێت بکرێ، دەبینی شتی زۆر سەیرو گەورە ئەنجام دەدەی، کە پێشتر لات وابوو، مەحاڵە!!

# کارگێڕی بە گـــوفتار

ئەو کەسەی جلو بەرگی خاوێن بێت، خەمی کەم دەبێت، هەر کەسیش خەمی کەم بوو، عەقڵو ژیری زیاد دەبێت، هەر کەسێکیش عەقڵو ژیری زیادبوو، تێگەیشتنی زۆر دەبێت.

ئیمام شافیعی

مێرووله، بێئەوەی ورتەیەک لە زاری بێتەدەرەوە، ئامۆژگاریمان دەکات!

بنجامین فرانكلین

چاکە بکەو فرێی دەرە دەریاوە، خۆئەگەر ماسییەک ڕووبەڕووت هات، خودا دەتپارێزێت!

پەندێكی تورکی

لەگەڵ خاوەن ژیرو هۆشمەندەکان - چ دۆست بن، چ دوژمن - دابنیشە، چونکە عەقڵ، دەکەوێتە سەر عەقڵ.

پەندێكی عەرەبی

هەنگی ئیشکەر، کاتی خەمخواردنی نییە!

ویلیام بلیک




# بەگوڵاوی وشەکانت، مرۆڤ دروست بکە!

لە سووچی یەکێك لە میترۆکاندا، مێردمنداڵێکی لاوازی خەمبار، قەڵەمی ڕەساسی دەفرۆشتو لەگەڵیدا سواڵی دەکردو دەستی لە خەڵکی پان دەکردەوە!

جارێکیان کابرایەکی بزنسمان بەلایدا تێپەڕیو دۆلارێکی بۆ خستە سەر دەستەسڕەکەیو بەپەلە خۆی هاویشتە ناو میترۆکە!

بەڵام پاش هەندێك، دووبارە لە میترۆکە دابەزیو گەڕایەوە بۆ لای مێردمنداڵەکە، چەند قەڵەمێکی هەڵگرتو بە داوای لێبوردنەوە پێی ڕاگەیاند؛ کە بیری چووبوو ئەو قەڵەمانە هەڵبگرێ کە پارەکەی دابوون، لە کۆتاییشدا پێی گوت: تۆش وەکو من بزنسمانیو شتومەکت هەیە بۆ فرۆشتن، نرخەکانیشت زۆر گونجاون، پاشان سواری میترۆی دووەم بوو، لێیدا ڕۆیشت!

دوای چەند مانگێك لەم هەڵوێستەو لە یەکێك لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا، کارمەندێکی فرۆشیاری جوانو شیك لەم پیاوە بزنسمانە هاتە پێشەوەو خۆی پێ ناساندو پێی گوت: دەزانم، کە تۆ نامناسیتەوە، منیش تەنانەت ناویشت نازانم بەڵام من هەرگیز تۆم لەبیر ناچێتەوە، چونکە تۆ ڕێزو کەرامەتت بۆ گێڕامەوە، چونکە من پێشتر سواڵکەرێك بوومو قەڵەمی ڕەساسم دەفرۆشت، تا تۆ هاتیو پێت ڕاگەیاندم، کە من بزنسمانمو سواڵکەر نیم!!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:-

١. زۆرجار وتەیەکی ئێمە ڕۆحێکی نوێیەو زۆر مرۆڤی مردوو، زیندوو دەکاتەوە!

٢. زۆر کەس هەن؛ گەیشتوون بە پلەی بەرز، لە ئەنجامی ئەوەی کەسێکی دی، پێی ڕاگەیاندوون؛ کە ئەوان دەتوانن کاری گرنگ بکەنو زۆر لەوە بە تواناترن، کە هەستی پێ دەکەن.

٣. زۆرکەس خۆی دۆزیوەتەوەو جارێکی دی متمانەی بەخۆی کردووەتەوە، کاتێك مرۆڤێکی گەورە، متمانەی پێبەخشیوەو دەستی گرتووەو بە تواناکانی خۆی ئاشنای کردووە!

٤. زۆرجار پەیامێك بەسە، بۆ گۆڕینی ئاراستەی ژیانی مرۆڤێك.

٥. ئەو مرۆڤانە گەورەن، کە هەستمان پێدەکەنو ڕێزمان دەگرن، ئێمەش لەگەڵیاندا هەست بە گەورەیی خۆمان دەکەین.

٦. کەسانێکی زۆر لە پەراوێزی ژیاندا فەرامۆش کراون، وتەیەکی ناسك، هەستێکی گەرم، خەندەیەکی هێمن، ئاسوودەیی بە ڕۆحیان دەبەخشێ، دەبا ئێمەش درێغی نەکەین لە بەخشینی!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

خۆپەرستی، حەسوودی بەرهەم دەهێنێت، حەسوودیش ڕقو کینە بەرهەم دەهێنێت، ڕقو کینەش، ناکۆکیو جیاوازی بەرهەم دێنیت، جیاوازیو ناکۆکیش، پەرتەوازەیی بەرهەم دەهێنێت، پەرتەوازەییش، لاوازی بەرهەم دەهێنێت، لاوازیش، زەلیلی بەرهەم دەهێنێت، زەلیلیش دەبێتە هۆی نەمانی دەسەڵاتو دەوڵەتو نەمانی نیعمەتو تیاچوونی نەتەوە. **بسمارک.**

ناتوانین دەستبەرداری ئەم سێ خاڵە بین.. خۆشەویستی.. بۆئەوەی بتوانین بەرگەی ئەو شتانە بگرین کە ئەستەمە بەرگەگرتنی، ئازایەتی: بۆئەوەی ئەو شتانە بگۆڕین، کە گۆڕینیان ئەستەمە. دانایی: بۆئەوەی جیاوازی لە نێوان ئەم دووانەدا (ئازایەتیو خۆشەویستی)دا بکەین.

پیاو تەنها جارێك دەگری، بەڵام لەو جارەدا فرمێسکی خوێنین هەڵدەوەرێنێت. **بیکنسفیلد**

ورگی گەورە، بیری تیژ بەرهەم ناهێنێت. **دیمۆستین.**

لە پێشتەوە شێرێکی دڕندە هەبێت، زۆر لەوە باشترە، کە لە دواتەوە سەگێکی ناپاك هەبێت.
پەندێکی ئێرلەندی

پێویستە مرۆڤ بخوات، بۆئەوەی بژی، نەك بژی، بۆئەوەی بخوات. **سوقرات.**

کەسی ئازا، بەسەر مەترسییەکاندا سەردەکەوێت، پێش ئەوەی بیانبینێت.
بوبلیلیۆس سیرۆس

# کێشەکانی ڕێگاوبانو چارەسەرکردنی قەرەباڵغی لە شارەکاندا

## دیدارێك لەگەڵ بەڕێز مامۆستا «بورهان محمد شریف» خاوەنی بڕوانامەی ماستەر؛ لە بواری ئەندازیاریی گواستنەوەو مامۆستا لە کۆلێجی ئەندازیاریی زانکۆی سلێمانی

ئا: خەندە عوسمان

- هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەکانی ڕێگاوبان چین؟

* (Three Es=Engineering، Enforcement and Education)؛ مەبەست لەم سیانەیە «هۆکارە ئەندازیارییەکان، جێبەجێکردنی یاسا، وشیاری کۆمەڵایەتی»، لە هەموو دنیادا، کە باسی کێشەی هاتوچۆو ڕێگاوبان دەکرێت، نەك تەنها لە کوردستان، لە هەموو جیهاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ هۆکارە.

- لە کوردستاندا تا چەند کێشەکانی ڕێگاوبانو هاتوچۆ، گەیشتوونەتە ئاستێك، کە بڵێین لە قەیراندایە؟ ئایا ئامارەکان، سەبارەت بە ڕێگاوبان لە ساڵانی ڕابردوودا، ئاماژە بەچی دەکەن؟

* بە پێی توێژینەوەیەك، لە ساڵی ١٩٧٦ تا ساڵی ٢٠٠٥، ٧٥٠٠٠ کەس، بە ڕووداوەکانی هاتوچۆ، گیانیان لەدەستداوە، هەروەها بەپێی توێژینەوەیەکی نێودەوڵەتی، لە ساڵی ٢٠٠٦داو لە عێراقدا، لە هەر ٠٠٠ ١٠٠ کەسێك، ٣٢ کەس بە ڕووداوەکانی هاتوچۆ گیان لەدەست دەدات، کە زۆرترین ڕێژەیە لەسەر ئاستی هەموو وڵاتانی ناوچەکەو وڵاتانی عەرەبی، بەپێی ئامارەکانی ڕێکخراوی تەندرووستی جیهانی، ساڵانە یەك ملیۆنو ٢٠٠ هەزار گیان لەدەست دەدات، نزیکەی ٥ ملیۆن بریندارمان هەیە بە هۆی گرفتی ڕێگاوبانەوە، پێشبینی دەکرێت لە ساڵی ٢٠٣٠ ئەو کەسانەی، کە گیان لەدەست دەدەن بەهۆی ڕووداوەکانی هاتوچۆ ساڵانە ببێت بە ٣ ملیۆنو ٦٠٠ هەزار کەس، ئەم ئامارە پێمان دەڵێت، ئەم دیاردەیە ترسناکە، هەم قەبارەکەشی گەورەیە، هەنگاوەکانیش لە ئاست قەبارەی گرفتەکەدا نییە، لە ساڵی ٢٠٠٦ بە پێی توێژینەوە نێودەوڵەتییەکان عێراق خراپترین حاڵەتی ڕەوشی ڕێگاوبانی هەیە. لە ڕاستیدا بەپێی پێوەرە جیهانییەکان، پێویستە هەموو اکم$^2$ لە دانیشتووان، کە ١٠٠ کەسی تێدا دەژی، بەدرێژایی اکم تۆڕەکانی ڕێگاوبان هەبێت. لە ساڵی ٢٠١٢، لە عێراق، چڕیی دانیشتووان ٧٥ کەس/کم$^2$، واتە: چڕیی ڕێگاوبان دەبێت بۆ هەر اکم$^2$ ڕووبەر بڕی ٠،٧٥کم ڕێگاوبان هەبێت، بەڵام لە واقیعدا تەنها ٠،١٨کم/اکم$^2$ هەیەو واتە: پێویستی بڕی ٠،٥٧ کم بۆ هەر کیلۆمەتر دووجا، تۆڕی ڕێگاوبان ئەنجام بدرێتو بۆ ئەم مەبەستە تۆڕەکانی ڕێگاوبان بەدرێژایی ٤٢٠ هەزار کیلۆمەتر ئەنجام بدرێت! هەروەها بەپێی ئامارەکانی بانکی نێودەوڵەتی، ساڵی ٢٠٠٦ هەموو ١٠٠٠ کەسێك ٧٩ سەیارەیان بەرکەوتووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٠دا، هەموو ١٠٠٠ کەسێك، ٣٣ ئۆتۆمبێلی بەرکەوتووە. لە هەرێمی کوردستان، بەپێی ئاماری مانگی ١٢ی ساڵی ٢٠١٢ ملیۆنێكو ٤٣ هەزار ئۆتۆمبێل هەبووەو لە ئێستادا، نزیکەی ١،٣ ملیۆن ئۆتۆمبیل هەیەو تەنها لە سنووری پارێزگای هەولێردا، ٦١٠ هەزار ئۆتۆمبێل، هەڵگری تابلۆی هەولێر هەیەو لەمساڵدا، ٧٧ هەزار ئۆتۆمبێلو لێخوڕ تۆمارکراون. دانیشتووانی هەرێم، بە پێی ئاماری وەزارەتی پلاندانان ٥ ملیۆنو ٥٥٣ هەزار کەسە، لە هەندێ ئاماری دیکەش ٧ ملیۆنە، ئەگەر ئێمە ٥ ملیۆنەکە هەژمار بکەین، ئێستا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت؛ ئێمە کێشەیەکی زەقمان هەیە، کە پێی دەوترێت کێشەی ڕێگاوبان.

- لە کوردستاندا، سەرچاوەکانی درووستبوونی ئەم کێشانە، بۆچی دەگەڕێنەوە؟

یەکەم:- لە کوردستان لەسەر ئاستی ئەندازیاریو هونەری دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانە:- لە بواری پلانو توێژینەوە: لاوازیو کارانەبوونی پلانو توێژینەوە لە کوردستاندا، ئەو پلانەی، کە هەیە؛ یان سستە، یان لە ئاستی پێویستدا نییەو وەکو پێویست لە ئاستی قەبارەی کێشەکەدا نییە، لە هەندێ حاڵەتدا، پلانمان نییە، هەندێ جاریش، کە پلان هەیە، ئایا پلانەکە تاچەند پێکاویەتیو سەرکەتووەو چەندەی لێ جێبەجێ دەکرێت؟چەند هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت.

نارۆشنیی سیاسەتی گواستنەوە لە هەرێمی کوردستاندا: نارۆشنییەك هەیە لە سیاسەتی گواستنەوەدا، ئێمە خاوەنی سیاسەتێکی زانستییانەی واقعییانەی وەها نین کە بگونجێت لەگەڵ هەلومەرجو واقیعی هەرێمی کوردستان، خاوەنی بنەمایەکی بەهێزو پتەوو سیاسەتێکی کارا نین، سیاسەتەکە ئەگەر هەشبێت لە کەمو کوڕیدایە.

لە ڕێگاوبانو گواستنەوەدا پێویستە توێژینەوەمان هەبێت: File study& Transportation Study نەبوونی

بۆ هەریەکێك لە کێشەکانو پێکهێنەرەکانی گواستنەوە، دەبێت فایلی خۆیمان هەبێت، بەداخەوە ئێمە ئەو فایلانەمان نییە، یان لە ئاستی پێویستدا نییە، ئێستا لە جیهاندا ئیش لەسەر توێژینەوەو داتای پێویستو کۆکراوەو شیکارە زانستییەکان

دەكرێتو سەرەنجام بڕیارو كاری پێدەكرێت، سەرچاوەكانی دروووستكردنی بڕیار، لە بواری گواستنەوە لە هەرێمی كوردستاندا، تا ڕادەیەك ڕۆشن نین.

كەمی پسپۆڕی ڕێگاوبان: بۆ نموونە لەسەر ئاستی هەرێمو پارێزگای سلێمانیش، هەڵگرانی ماستەرو دكتۆرا لە بواری گواستنەوەو ڕێگاوبان زۆر كەمن.

نەبوونی بەشی تایبەت لە بواری ئەندازیاری گواستنەوەو ڕێگاوبانو هاتوچۆدا: لە ناوەندە ئەكادیمیەكانی هەرێمی كوردستان، لە زانكۆو پەیمانگاكان بەشی سەربەخۆو تایبەتمەند كەمەو نییە تا پسپۆڕ لەو بوارە درووست بكات.

نەبوونی ناوەندی توێژینەوەی زانستی لە بواری گواستنەوەو ڕێگاوبان.. تا ئێستا ناوەندێكی سەربەخۆمان نییە، كە كار بكات لەو بوارەدا.

نەبوونی پەیمانگای پیشەیی: وەك ئاشكرایە، ڕێگاوبانو گواستنەوە، بە مرۆڤ جێبەجێ دەكرێت، كە من پەیمانگایەكی پیشەییم نەبێت، خەڵكو كادیری پیشەییو دەرچووانی لێ بەرهەم بێت، كادیری بەتوانام بۆ درووست نابێت، لەلایەكی تر نەبوونی خوێندنی دبلۆمی باڵا بۆ هەڵگرانی بەكالۆریۆسی ئەندازیاری لە بواری گواستنەوەو ڕێگاوبان، بۆ نموونە: گرنگە ئەوانەی لە وەزارەتەكانی گواستنەوەو ئاوەدان كردنەوەو شارەوانی لە بواری ڕێگاوبانو گواستنەوەدا، ئیش دەكەن هانیان بدەین بە لایەنی كەمەوە دبلۆمیان هەبێت لە (گواستنەوە، ڕێگاوبان، ترافیك، .......).

كارنەكردن بە توێژینەوە زانستییەكان: ئەمە خاڵێكی زۆر زەقە لە كوردستاندا، بێباكیو بێ‌متمانەیی لایەنە پەیوەندیدارەكان بە توێژینەوە زانستیەكانو ئەو توێژینەوانەی، كە دەكرێن، بەداخەوە كاریان پێناكرێت.

دیاریـنـەكـردن، یـان پـابـەنـدنـەبـوون بـە ئـاسـتـی خزمەتگوزارییەكانی ڕێگاوبان: یەكەم دەروازەی چونەژوورەوە لە ڕێگاوباندا، دەبێت ئاستی خزمەتگوزاری شەقامو ڕێگاكان دیاری بكەین، ئەو ڕێگایانەی، كە درووست دەكرێن، دەبێت ئاستی خزمەتگوزارییەكەیان دیاری بكرێتو هەر ئاستێك بێت پابەندبین بە مەرجەكانییەوە.(A-B-C-D)

تۆڕەكانی ناو شارو تۆڕەكانی دەرەوە پۆلێنكردنو ناونانی خۆیان هەیە، كاتێك بڕیار دەدرێت، كە ئەم ڕێگەیە درووست بكرێت، دەبێت ئاستی خزمەتگوزارییەكەیو بودجەكەش بەپێی ئەو ئاستە دیاری بكەین.

لاوازی هەماهەنگی لە نێوان وەزارەتە پەیوەندیدارەكان: لایەنە پەیوەندیدارەكان وەكو وەزارەتەكانی (شارەوانی، ئاوەدانكردنەوە، گواستنەوە، كارەبا، ناوخۆ) هەماهەنگییەكان لە ئاستی چاوەڕوانكراو نین.

كەمی، یان نەبوونی خولی ڕاهێنان: پێویستە هەموو كەسێك لە بواری گواستنەوەوە ساڵانە (٤٥) كاتژمێر خولی ڕاهێنانی هەبێت، پێویستە خولەكان بواری تەكنەلۆجیاو جێبەجێكردنو پراكتیكیش بێت، نەك تەنها هەر لە بواری تیۆری زانستی ڕێگاوبان بێت.

دووەم:- لەبواری كێشەكانی دیزاینی ڕێگاوبان: تا ڕادەیەك لاوازبوونو كارانەبوونی بەشەكانی دیزاین، ئەو كەسانەش، كە ئیشی تێدا دەكەن، هاندانو بایەخدان پێیان كەمە، هەروەها نەبوونی خولو سۆفتوێری نوێی پێویست بۆیان، هەندێجار خودی دیزاینەكە فەرامۆش دەكرێت، یان هەندێ لە بڕگەكانی، خاڵێكی تر لاوازیو ناواقیعی حاڵەتی خەمڵاندنە بۆ پڕۆژەكانی گواستنەوەو ڕێگاوبان.

سێیەم:- لە بواری جێبەجێكردندا: نەبوونی ژمارەی تیمی پێویستو كاراو چالاك لە بواری گواستنەوەو ڕێگاوبان ئیش بكات لە كوردستاندا، ئەو تیمانەی هەن؛ وەكو ژمارەیان، وەكو كوالێتیو ئەو پێداویستییانەی بەردەستیان، لە ئاستی پێویستدا نین، كەمیی كۆمپانیای پسپۆڕ لە بواری ڕێگاوبان، كە ئەمڕۆ كۆمپانیاكان پۆلێن نەكراون لەسەر ئاستی پسپۆڕییان، كۆمپانیاكانی ئێمە وەكو جۆكەریان لێهاتووە لە یەك كاتدا ئیشی ڕێگاوبانو بیناو تەجهیزو .......هتد دەكات، لەبەرئەوە ئەو پسپۆڕییە كۆنابێتەوە، دەستەكانی سەرپەرشتیاری وەك ژمارەو جۆرایەتی، كەمی ژمارەی تاقیگەكانی بیناسازی لە هەرێمی كوردستاندا، ئەگەر تاقیگەمان هەبێت، كۆنترۆڵی هەموو پڕۆژەكانی پێبكرێتو ئامێرو كەلوپەلەكانیان، سەردەمییانە بێتو هەڵسەنگاندنو بەراورد بۆ ئەنجامەكانیان بكرێت بەدڵنیاییەوە بەرهەمو ئەنجامەكان جۆرێكی تردەبێت، هەروەها كەمی، یان نەبوونی بەكارهێنانی تەكنەلۆجیای نوێ، هەندێك لەو تەكنەلۆجیایانە هاتوونەتە كوردستان، بەڵام لە ئاست پێویستییەكانی ئێمەدا نین، نەبوون، یان لاوازیو كەمی هاندانی ماددیو مەعنەوی بۆ ئەندازیارانو تیمەكان، ئەم سێكتەرە گرنگە..

چـوارەم:- لە بـواری یاسایی: لاوازیو فەرامۆشكردن لە جێبەجێكردنو كاركردن بە یاساكانی شارەوانیو ڕێگاوبانیشدا، ئەگەر ئێمە یاساكانی ساڵی ١٩٣١و ١٩٣٥ جێبەجێ بكەین، دەسكەوتی زۆرمان دەبێت! هەندێجار مەرجە هونەرییەكان لە یاسایی بەڵێندەرایەتیش فەرامۆش ئەكرێت.

**- ئەو پرنسیپانە چین، كە بەكار دەهێنرێت لە پرۆسەی پلانسازی ڕێگاوبان؟**

پرۆسەی پلانسازی، پێویستە وەڵامـدەرەوەی ئەم خواستانە بێت، گونجاوترین جۆری ڕێگاوبانمان بۆ فەراهەم بهێنێت، لەگەڵ زۆرترین دووری ڕێگاوبانو دابینكردنی بودجەی گونجاو، كە ئەمەش ئاسانترین جووڵە فەراهەم دەهێنێت بۆ بەكارهێنەرانیو زۆرترین خێراییو سەلامەتیو ئەوپەڕی گونجاویو ئاسوودەیی لە پرۆسەی گواستنەوەدا دەبێت هەبێت، لە پرۆسەی پلاندانان چوار قۆناغی سەرەكیمان هەیە:

یەكەم: توێژینەوەی ناو ئۆفیس: توێژینەوە، یان لێكۆڵینەوەی ناو ئۆفیسە، بۆ ئەو زانیارییانەی، كە هەمانە سەبارەت بە پڕۆژەكە، ئەمانەی خوارەوە دەبێت هەمووی هەبێت لە توێژینەوەی ناو ئۆفیس:

١- (ڕاپۆرتی ئەندازیاریمان هەبێت سەبارەت بە پڕۆژەكە.

٢- نەخشەی گونجاوو وێنەی ئاسمانی، تا لە تۆپۆگرافی شوێنەكە شارەزابین.

٣- ڕاپۆرتی كشتوكاڵی ناوچەكە.

٤- ڕاپۆرتی جیۆلۆجی.

٥- ڕاپۆرتی هایدرۆلۆجی؛ بۆ زانینی بڕی بارانو بەفر، ئاستی ئاوی ژێرزەویو تیشكی خۆرو بەرزترینو نزمترین پلەی گەرما؟

٦- ڕەوشی كانزاكان لە ناوچەكە ـكەشوئاووهەوای ناوچەكە.

٧- ڕاپۆرتی ترافیك، دەبێت بزانین لە ناوچەكە قەبارەی هاتوچۆ چەندە، جۆری لێخورەكان، چ جۆرە لێخورێكمان هەیە، بەكارهێنەرەكانی كێن، لە چ كاتێكدا زۆرترین فەرەباڵغیمان هەیە، لە بەیانیان، یان نیوەڕوان، یان ئێواران، یان هەرسێكیان.

٨- لە بواری كۆمەڵایەتیو دیمۆگرافی.

٩- لەڕووی زۆنەکانی ناوچەکە، دەبێت بزانین ئەم ناوچەیە بۆ چ بوارێك دانراوە، بۆ (کشتوکاڵ، دانیشتووانو نیشتەجێبوون، گەشتوگوزار، بازرگانی ........هتد)، چونکە هەر یەکێك لەم زۆنانە، بۆ نموونە زۆنێکی پیشەسازی، سیفاتو تایبەتمەندییەکانی جیاوازە لەگەڵ زۆنیکی نیشتەجێبوون.

١٠- بواری ژینگەی ناوچەکە چۆنە، پانتایی ژیان لەو شوێنە چۆنە بە گیانەوەرانو تەنانەت ڕووەکەکانیش دیاری بکرێت، هەروەها جۆری ڕووەکەکانیش ئەو ڕێگایەی، کە دروست دەکرێت، نەبێتە هۆی لەناوبردنی جۆرێك لە ئاژەڵ، یان ڕووەك -لەڕووی مێژووییەوە، (قەڵای مێژوویو کەلەپوور تەنانەت گۆڕستانیش) هەموو ئەمانە یاداشت کرابن لە ڕاپۆرتەکەمانو ئەم پڕۆژەیەی ئێمە؛ تا چەند دەبێتە هۆی پیسبوونی ناوچەکە.

١١- خاڵێکی دیکە لە ڕەهەندی داراییـەوە، ئەم پڕۆژەیەی ئێمە چەندی تێدەچێت، هەر لە بنیاتنانو فەرەبوو کردنەوەو بەڕێوەبردنو ئیشپێکردنو چاکسازی ساڵانە چەندی تێئەچێت، بەرامبەر بەمە ناوچەکە چەندی تیا سەرف دەکەیت، چونکە یەکێك لە کاریگەرییەکانی دروستکردنی ڕێگاوبان دەبێتە هۆی پێشکەوتنی ئابووریی ناوچەکە، ئایا ئەم ڕێگایە، یان ئەم پڕۆژەیەی ئێمە، تا چەند دەبێتە هۆی گەشەو پێشکەوتنی ئابووریی ناوچەکە، دوای ئەوە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی دانیشتووانی ئەو شوێنە، چەند گەشەی کۆمەڵایەتی بەخۆیانەوە دەبینن، خاڵێکی تر، کە گرنگە، گەشەی کەلتووری، کە زۆر گرنگە، ئایا ناوچەکە لە ڕووی فەرهەنگیو کەلتووری چەند گەشە دەکات. هەروەها پێشکەوتنی شوێنی-مکانی- ئایا ئەم ڕێگایە، کە دەکرێت، ئەم ناوچەیە شێوازی لە دانیشتووانەوە، بەشێکی دەبێت بە پیشەسازی، دەبێت بە گەشتیاری بەهۆی دروستبوونی کۆمەڵێ کارگەو پڕۆژەی گەشتیاری دروست دەبێت، بەهۆی ئەم ڕێگایە پڕۆژەی بازرگانی دروست دەبێت، چیمان هەیە لەو بوارەدا، دەبێت بە هەندی وەربگرین هەر لە بواری بازرگانی، دەبێت بزانین هەتا چالاکییە بازرگانییەکان لەدوای تەواوبوونی پڕۆژەکە چی بەسەردێت، چونکە ناکرێت ئێمە ڕێگایەك دروست بکەینو ناوچەکە هەروەکو خۆی بمێنێتەوە کۆتا شت، کە خزمەت بەو بوارە دەکات پێگەی دەوڵەتداری، کە بریتیە لە پێشکەوتنی ڕەوشی سیاسیو ستراتیجی ناو وڵات، بۆیە گواستنەوە، هەتا گەشەی پێبدەین ئەو ٥ گەشەیەمان دەداتێ، بەڵام ئەگەر گواستنەوەو ڕێگاوبان لە ئاستی پێویست نەبوو ئەوا ٥ جۆر گەشەمان دوا دەکەوێت، هەتا بابەتی دامەزراندنی دەزگاکانیش پەیوەستە بە گواستنەوەو ڕێگاوبان، چونکە چەند تۆڕی ڕێگاوبانمان کاراو تەندرووست بێت، ئەوا بێگومان ڕەهەندی سیاسیی وڵات، دامەزراویو سەقامگیریی زیاتر، بەخۆیەوە دەبینێت.

دووەم:- ڕووپێوکردنی سەرپێیانە (استطلاعی): ڕەوشی ناوچەکە لە ڕووی بەرزو نزمی، جۆری خاکەکەو ڕەوشی خاکەکە لە ناوچەکەدا گرنگە، پانتایی دانیشتووان لە شوێنەکە چۆنە؟ ژمارەی دانیشتووانو جۆری دانیشتووان؟ ئایا چەند گوندمان هەیە، شارۆچکەمان هەیە؟ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی دانیشتووان چۆنە؟ ژمارەی خێزان؟ هەموو ئەمانە لە ناوچەکە بەهەند وەربگیرێت، خزمەتگوزاری (کشتوکاڵی، بازرگانی، پیشەسازی، لەو ناوچەیە هەبێت هەر هەمووی بەهەند وەربگیرێت)، ئەگەر لەو ناوچەیە، کۆمەڵێ پێکهاتەمان هەبێت، دەبێت بەهەند وەربگیرێن، ئایا ڕووبارمان هەیە؟ هێڵی ئاسنینمان هەیە؟ فڕۆکەخانە هەیە؟ هۆکارەکانی گواستنەوە چۆنە؟ لەو ناوچەیە ئایا ترەمو تونێلمان هەیە؟ پێش ئێمە کرابێت ئەمانە پێویستە بەهەن دوەربگیرێن؛ چونکە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر پڕۆژەکەمان هەیە.

سێیەم:- ڕووپێوکردنی سەرەتایی: لە ڕووپێوکردنی سێیەمماندا، کۆمەڵێ شت زۆر گرنگە، بەهەند وەربگیرێت؛ وەك: هەڵسەنگاندنی ژینگەییو دارایی، لە بواری ژینگەی دەبێت بزانین چێنراوەکانی ئەم ناوچەیە بەهەند وەربگیرێن؛ جۆرو قەبارەی چێنراوەکان دارستانە درەختی بەرهەمدارە زەوی کشتوکاڵییە، ڕووەکی سروشتی ناوازەیە لە ناوچەکە جۆری ئاژەڵەکان ماڵیین، یان کێوین، دەبێت بە هەند وەربگیرێت؛ چونکە ناکرێت جۆرێك لە جۆرەکان قەڵاچۆبکەین لە کاتێکدا دەتوانین ئاڕاستەی ڕێگاکە بگۆڕین. هەڵسەنگاندنی دارایی لە هەڵسەنگاندنی دارایی چوار خاڵ زۆر گرنگە لەبەرچاو بگیرێت:

١- پارەی بەکارهێنەرانی زەوی، هەندێ ڕێگا بۆ بەکارهێنانی پێویستە باجێك بدرێت.

٢- پارەی تێچوون.

٣- پارەی چاککردنەوەی پڕۆژەکە چەندە؟ چەندمان پێویستە؟

٤- ئایا سوودی بەکارهێنەرانی ئەم ڕێگایە چییە؟

کۆمەلگە مرۆییەکان لە ناوچەکە چۆنە؟ ئایا گوندنشینن، شارنشینن.. ئەگەر گوند بێت بۆ نموونە، دەبێت ئەساسی تیرەو عەشیرەتو پێکهاتە کۆمەڵاتییەکان بە هەند وەربگیرێت، سروشتی ناوچەکە پێویستە بە هەند وەربگیرێت. ئایا ناوچەکەمان شاخاوییە، دەشتە، بەردەڵانە؟ هەروەها هێزی کارو بەکارهێنەر لە ناوچەکەدا چۆنە؟ چونکە ناکرێت پڕۆژەیەکمان هەبێت، لە دووری ٥٠-١٠٠کم هێزی کاری بۆ بهێنین.

چـوارەم:- ڕووپێوکردنی کۆتایی: ڕاپۆرتی کۆتایی پێویستە دیتەیلی تەواوی پڕۆژەکە هەبێت، پێگەی کۆتایی دەستنیشانکرابێتو بوبێتە بڕیاری کۆتایی.

**لە کۆتاییدا وەکو پسپۆڕێك لە بواری ڕێگاوباندا پێشنیاری بەڕێزتان چییە؟ میکانیزمی نوێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕێگاوبان؟**

پێویستە ئەم هەنگاوانە بگیرێنە بەر:

١-ڕێکخستنی جوولـەی هاتوچۆ لـە شـەقـامو شارێگەکان بەشێوەیەکی زانستیانەترو باشتر لە ئێستا، تاکو زۆرترین خێرایو سەلامەتی بۆ بەکارهێنەرانی فەراهەم بێت.

٢- فراوان نەکردنی شەقامەکان لەسەر حسابی پیادەڕەو.

٣- زیندووکردنەوەو فراونکردنو پەرەپێدانی گواستنەوەی گشتی لە سەرجەم شاروشارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان.

٤- ڕێکخستنی گواستنەوەی خوێندنگەو زانکۆو پەیمانگاکانو فەرمانگەکان؛ چونکە هەتا گواستنەوەی ئەمانە ڕێك نەخرێت، ناتوانین کێشەکان کۆنتڕۆل بکەین.

٥- سوودمەندبوونو بەکارهێنانی بەڕێوەبردنی کارگێڕیی زیرەك لە گواستنەوەی شارەکاندا.

٦-گرنگیدانو بایەخدان بە پارکو پارککردنو فراوانکردنو نۆژەنکردنەوەی پارکەکان

٧-لـە ڕووی یـاسـایـیـەوە یاساکانی (هـاتـووچـۆ، ڕێـگـاوبـان، شارەوانییەکان) جۆرێك لە جۆرەکان هەمواربکرێنەوە.

٨- پلانی گواستنـەوە، لەگەڵ پلانی نیشتەجێبوونو گەشتوگوزارو پیشەسازیو ئەمنیدا، هاوتەریب بێت.

٩- هەمووبینایەکی بازرگانی، مۆڵەتی دوو تا سێ نهۆم بۆ پارك بێت.

١٠- لە کۆتاییدا پلانی سەلامەتیی هاتووچۆ، بە مانا فراوانەکەی سەلامەتی هاتوچۆ لە کوردستان، داخوازییەکی هەنوکەییە، تا گرفتی هاتوچۆ، کەمترو سنوودارتر بکریت.

ن: دکتۆر: علي الحمادي
و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

# هونەری درووستکردنی پەیوەندییە ناوازەکان

پەیوەندییەکان، لە ژیانی مرۆڤدا بەهایەکی مەزنیان هەیە؛ چونکە کەس ناتوانێت بەبێ کەسانی تر هەڵ بکات، هەروەکو چۆن زۆرێك لە بیرۆکە سادەو ساکارەکان، بە هۆی پەیوەندییەکانەوە پەرەیان پێ دەدرێتو بەرێ دەکرێنو دەگەنە ئاستێکی باڵا.

زۆرێك لەوانەی لە نێوان بیرمەندو ژیرو فەرمانڕەواو زرنگەکان هیچ کێشو بەهایەکیان نییە، بەسەرنکەسانی دیکەدا سەردەکەونو بەرەو پێش دەچن، نەك لەبەر شتێك، تەنها ئەوە نەبێت، کە خاوەنی پەیوەندییەکی ناوازەو بە هێزن.

لەبەرئەوە، ئێمە داوا لە خاوەن کاریگەریی بەسوودو بەدیهێنەری ژیانی ئاسوودە دەکەین، کە ئەم گۆڕەپانە فەرامۆش نەکەنو لەو چوارچێوەیە دەرنەچن؛ چونکە ئەمە دەروازەیەکی فراوانو گرنگە دەتوانن لەوێوە بچنە ناو گۆڕەپانە فراوانەکەی کاریگەری، ئەگەر دەتەوێت پەیوەندیت لەگەڵ کەسانی تردا، دابمەزرێنیت، ئەوا ڕێگای (دەم بەخەندە) (SMILE)ت پیشان دەدەین، ئەمەش بریتییە لە: پێنج ڕاسپاردە، کە لەم وشەیەدا کۆبووەتەوە بەمشێوەیە:

١. دەم بەخەندەبە: S: smile ٢. تەوقە بکە: M: make shake
٣. خۆت بناسە: I: introduce ٤. لایەنەکەی تر بناسە: L: learn
٥. بەچاوی خۆت پەیوەندی بکە: E: eye contact

ئەو پێنج ئامۆژگارییەی باسمان کرد، دەتوانرێت لە ماوەی کەمتر لە (٣) چرکەدا، سوودی لێ وەربگیرێ بۆ کەسێك بیەوێت خوونەریتی باش نیشان بدات، ئینجا لەوێوە دەتوانێت بەم سروشتەی بچێتە ناو دڵی خەڵکانی ترەوە، تاوەکو پەیوەندیی باشیان لەگەڵدا دابمەزرێنێت.

هەروەها ئاماژە بۆ (١٠) ڕاسپاردەی سەرەکی دەکەین، لە درووستکردنی پەیوەندییە ناوازەکان، ئەو ڕاسپاردانەش ئەمانەن:

١. با پەیوەندیەکانت لەگەڵ خەڵکدا تەنها بۆ ڕەزامەندیی خودای گەورە بێت، ڕاستگۆبە تێیداو دەستپاك بە، لە فێڵو هەڵخەڵەتاندنو دووڕوویی خۆت بەدوور بگرە. وریابە بەلەبەرکردنی دەمامکی قەڵب، چونکە بە خێرایی دەردەکەوێو لادەچێ ئەو کات وتەو ڕەفتارەکانت ئاشکرا دەبنو خوو ڕەوشتی نالەبارت بەدەردەکەوێت.

٢. بێگومان لە هەر پەیوەندییەك، کە درووستی دەکەیت، دەبێت ئامانجی ڕوونو ئاشکرات هەبێت، چونکە مەسەلەکە بێهودە نییەو بۆ کات بەسەربردن نییە.

٣. هەموو پەیوەندییەك، پەیوەندیی گرنگو کاریگەر نییە، بە واتایەکی تر، پەیوەندییەکان لە ڕووی بایەخو کارتێکردنەوە جیاوازن، بۆیە پێویستە پەیوەندییە کاریگەرەکان لە پرۆژەی کاریگەرییەکەت دیاری بکەیت، جەختی لەسەر بکەیتەوە، بیخەیتە پێشینەی بایەخی کارەکانت، ئەمەش زانای ئیتالی (پارێتۆ) لە بنەما بەناوبانگەکەی (٨٠/٢٠) بانگەشەی بۆ کردووە، بەم پێیە ٢٠٪ی پەیوەندییەکان لە ٨٠٪ی ئەو ئەنجامانەت بەدی دەهێنن، کە ویستووتە، بۆیە کاتی خۆت بە فیڕۆمەدە لە پەیوەندیی ناکاریگەر، لە ٨٠٪ی تێکۆشانو پارەو کاتت نەك تەنها لە ٢٠٪ لە پەیوەندییە گرنگو بە سوودو کاریگەرەکان خەرج بکە لە ئەندازەگیری ژیاندا.

٤. ئەگەر ویستت کاتەکەت کورت بکەیتەوە بە شوێن دوانگەی جەماوەریدا بگەڕێ، کە دەتگەیەنێ بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی لە ماوەیەکی کەمداو بە کۆششێکی ئاسان، نموونەی: تەلەفزیۆن، ڕۆژنامەوانی، ئینتەرنێت، ڕادیۆ، کۆڕی جەماوەریی، وتار، کاسێتی دەنگی، کتێب، هتد.

٥. ناسینی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی، پێکهێنانی پەیوەندیی گشتی لەگەڵیاندا، کارێکی گرنگو پڕبایەخە، بەڵام لەوە گرنگتر، پتەوکردنی ئەو پەیوەندییانەو وەبەرهێنانە لە بەرژوەندیی پرۆژە کاریگەرییەکەت، چەندین خەڵك هەن پەیوەندیی مەزنیان لەگەڵ سەرۆكو وەزیرو بازرگانو زاناو شارەزاو دەسەڵاتدارو ڕیشسپیو کەسانی تریشدا هەیە، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم پەیوەندییەیان وەبەرنەهێناوەو ئاڕاستەیان نەکردووە بۆ خزمەتکردنی خۆیان لە درووستکردنی ژیانو ڕوودانی گۆڕنکاری، پەیوەندیی نێوان ئەوانو کەسانی تر پەیوەندییەکی لاوازە، نەپتەوە، نە ئاڕاستەکراوە، نە مەبەستدارە، ئەو کەسانە خۆیان دەخەڵەتێننو کاتی خۆیان بە فیڕۆ دەدەنو بەخۆیان پێدەکەنن.

٦. ئاگاداری ئەوانە بە، کە پەیوەندیت لەگەڵدا بەستوون، واهەست نەکەن، کە پەیوەندییەکەی تۆ، تەنها پەیوەندیی بەرژەوەندییەو بەس، بەڵکو پێویستە هەست بکەن، کە تۆ سووری لەسەر پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، ئەم پەیوەندییانەشت پەیوەندیی مرۆڤدۆستیو برایەتییە!

٧. ئەوەی دەیەوێ ژیان درووست بکا، پێویستە لەسەری کەسایەتییەکی بە هێز بۆ خۆی درووست بکا، بۆیە نابێت لە ڕێزو شکۆی خۆی کەم بکاتەوە، یاخود کەسایەتی خۆی لاواز بکا، تا بتوێتەوەو دابڕمێ لەلای ئەو کەسانەی حەزدەکا پەیوەندییان لەگەڵ درووست بکات.

٨. پارەوسامان ڕەگەزێکی گرنگە لە درووستکردنی پەیوەندییەکان، بێگومان پێویستیت بە پارەو دارایی دەبێ، تا لای کەسانی تر خۆت نزیك بکەیتەوە، هەروەکو چۆن ئەگەر بتوانیت بە هۆی پەیوەندیت لەگەڵ کەسانی کاریگەر پارەو داراییان زیادبکەیت، ئەوا هەنگاوی خێرات بەئاڕاستەی وەبەرهێنانی ئەم پەیوەندییە لە بەرژەوەندی پرۆژە کاریگەرییەکەت، چونکە سەرنجمان داوە؛ نزیکترین کەس لەخاوەن بڕیارانو جێبەجێکاران، ئەو کەسانەن، کە گەشە بە پارەو پووڵەکانی ئەوان دەدەن، هەرچەندە لەناو خەڵکیشدا کەمترین ڕێزو پلەو پایەو زانستیان هەیە.

٩. خەڵکی گرنگیی زیاترت پێ دەدەن؛ کاتێك هەست بەگرنگیدانی تۆ دەکەن بە ئەوان، بۆیە سور بە لەسەر سڵاوکردنی گەرموگوڕ لە کەسانی تر، تەوقەکردنی بە هێز، بە جۆرێك سڵاویان لێ بکە، وا هەست بکەن، کە تۆ زۆر دڵخۆشی بە دیداریان، بەڵکو هەمیشە هەست بکەن، کە ئەوان زۆر جێگەی بایەخی تۆن.

١٠. ئەو دەربرینەی لەسەر دەموچاوت دەردەکەوێ، زۆر گرنگترە لەو جلو بەرگەی لەبەری دەکەیت.

وەهاب حەسیب

# زاراوەی کارگێڕی

پلان (الخطة): پلان لە قەوالەیەکەدا دادەڕێژرێت، کە تێڕوانینێکی گشتگیرو فەرمیی لەخۆدەگرێت، پەیوەستە بەئاراستەی ئابووری گشتییەوە، ڕێنماییە تایبەتییەکانی حکوومەتی تێدا تۆمار دەکرێت.

پلان جیاوازە لە نەخشەکێشان (تخطیط)، هەموو پلانێك بەشێکە لە نەخشەکێشان، بەڵام هەموو پلانێك ناتوانێت گشت نەخشەکێشانێك لەخۆبگرێت. لە وڵاتە سۆشیالستییەکاندا، پلانی نەتەوەیی، دابەشد ەکرێت بۆ پلان لەسەر ئاستی بەش و کەرتەکاندا، هەروەها پلانی نەتەوەیی بەشێوەیەکی تر، دابەشد ەکرێت لەسەر ئاستی دامەزراوەو بەڕێوەبەرێتییە ئابوورییەکان.

بەشێوەیەکی گشتی، پلان لە ڕووی گشتگیریو ماوەی دیاریکراو چۆنێتیی تەواوکردنی کارەکەوە سێ جۆرە:

بۆ نموونە لە وڵاتە سۆسیالستییەکاندا پلان بەشێوەیەکی سەرتاسەری دادەڕێژرێت، بەشێوەیەك هەموو بەشەکان (بەشەکانی کارکردن لە وڵاتدا)و ناوچەکان لەخۆبگرێت، لە هەمان کاتدا هاوسەنگییەکیش لە نێوان تێچوونو داهاتدا دروست بکات.

بەڵام لەو دەوڵەتانەی، کە ئابوورییەکی تێکەڵاویان هەیە، پلانی نەتەوەیی ئاماژەیەکی گشتی هەیە، نەك ئامانجێکی دیاریکراوو سەپێنراو، بەڵام لە ڕووی دابەشکردنەوە؛ لەو وڵاتانەی، کە خاوەن ئابوورییەکی تێکەڵاون، پلان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت.

پلانی تەکتیکی (الخطة التکتیکیة): دەستەواژەی تەکتیك، لە بنەچەدا دەستەواژەیەکی ئەعجەمییەو لە بواری سەربازیدا بەکاردەهێنرێت، (واتە ئارەوی نییە) تێکەڵ بە زوانی ئارەبان بووە، وەك خۆی بەکاردەهێنرێتو بێ گۆڕانکاری ماوەتەوە. مانای تەکتیك واتە: ڕێکخستنێکی بەهێزی سەربازیی، یان ئامادەکردنی ئەو هێزە بۆ جەنگ، هەروەسا بە مانای ڕێگا، یاخود ڕێبازیش بەکاردەبرێت.

پلانی تەکتیکی، پلانێکی کورتمەودایە، ئامانجێکی کورت لەبەرچاو دەگرێت، یان بەکار دەهێنرێت بۆ ڕووبەڕوونەوەی دۆخێکی لەناکاوو چاوەڕواننەکراو، بە نموونە: (گرانبوونی نرخی کەرەستە سەرەتاییەکان، کە لە بواری بەرهەمهێناندا بەکاردەهێنرێت، بەهۆی کەمی سەرچاوە دابینکەرەکان، گۆڕانکاری لە بارودۆخی ڕامیاری ... تاد)، ئەو شێوازەی لە بواری جێبەجێکردنی پلانی تەکتیکیدا بەکار دەهێنرێت، جەختکردنەوەی ئامانجێکی نزیکەو کارکردنە لە تەواوکردنی ئەو ئامانجەدا بەخێرایی، بە شێوەیەکی ئاسایی ماوەی پلانی ماوەکورت لە ساڵێك کەمترە.

خۆماڵیکردن(التأمیم): واتە: گەڵ خاوەنی سامانە سروشتییەکانو پڕۆژە گرنگەکانی دەوڵەت بێت، هەروەها دەوڵەت بریکاری گەل بێت لە بەڕێوەبردنو بەکارهێنانی ئەو سەرچاوانەدا، بەشێوەیەك دەوڵەت سەرمایەدارەکان لە بەڕێوەبردنو قازانجی ئەو سەرچاوانە دوور بخاتەوە.

خۆماڵیکردن وەك دەستەواژە بریتییە لە: گۆڕانکاری شێوازی بەڕێوەبردنی دامەزراوە حکومییەکان لە جۆرێك ئیمتیازەوە، بۆ بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ، بەڵام مەبەستی بنچینەیی خۆماڵیکردن، کورت دەبێتەوە لە دابینکردنی دراو بۆ پڕۆژە تایبەتییەکان، بەگوێرەی «گرنگی پڕۆژەکە»و گۆڕینیان بۆ پڕۆژەی حکومیو بەڕێوەبردنی پڕۆژەکان بەشێوەی دامەزراوە، یان لە شێوەی کۆمپانیایەکدا، کە دەوڵەت خاوەنی هەموو پشکەکانی بێت.

خۆماڵیکردن، هەوڵێکە بۆ گونجاندن لە نێوان چەند باوەڕپێکراوێکی جیاوازدا، گرنگترینیان دوورخستنەوەی سەرمایەدارانە لەسوود وەرگرتن لە پڕۆژە گرنگەکانی دەوڵەت، ئەو پڕۆژانە پڕۆژە گشتییەکان بن، یاخود ئەو پڕۆژانەی، کە خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکان پێشکەش دەکەن. ڕەنگە هۆکاری یەکەمی خۆماڵیکردن لەو باوەڕەوە بێت، کە لە ڕێگای خۆماڵیکردنەوە بتوانرێت خزمەتگوزاری باشتر دابین بکرێت، یان خۆماڵیکردنی پڕۆژەکان مایەی دڵنیایی زیاتری سەربەخۆیی دەوڵەتن، لەوانەیە خۆماڵیکردن، هەوڵێك بێت بۆ خزمەتکردن، (دوور لە بەدەستهێنانی قازانجی تایبەت) بەمەبەستی بەرگریکردن لە وڵات، دەشێت خۆماڵیکردن لەلایەن خاوەنی پێشووی سەرچاوەکانەوە، بە ناپاکی لە قەڵەم بدرێت... هتد. لەوانەیە خۆماڵیکردن شێوازێکی تر وەربگرێت، بەتایبەت ئەگەر هۆکاری کارەکە، ڕامیاریو ئابووری بێت، بەتایبەت کاتێك سەرچاوەکانی وڵات لەلایەن هێزە دەرەکییەکانەوە بۆ مەبەستی تایبەتیان قۆرخ کرابێت. وەك ئەوەی لە کاتی خۆماڵیکردنی نەوت لە ساڵی ١٩٣٨ لە مەکسیكو ساڵی ١٩٥١ لە ئێران ڕوویاندا، یان ساڵی ١٩٦٥ کاتێك کوبا وەبەرهێنانی بێگانەی لە وڵاتدا خۆماڵی کرد، یاخود ساڵی ١٩٥٦ کە لەلایەن دەوڵەتی میسرەوە کەناڵی سویس خۆماڵیکرا.

لایەنە باشەکانی خۆماڵیکردن، بریتییە لە: بەرزکردنەوەی توانای بەرهەمهێنان، بێئەوەی جیاوازی توانای کڕین لە نێوان خەڵکیدا دروست بکات "واتە هاوسەنگی توانای کڕینی چینەکان لە بازاڕدا دەپارێزێت" هەموو جۆرەکانی تەنگەژە کەمدەکاتەوە، بێکاری ناهێڵێت، دادگەریی ئابووری بەدیدێنێت، بەکاربەر دەپارێزێت لە هەموو گۆڕانکارییەك، کە ڕاگەیاندنو پڕوپاگەندە درووستی دەکەن.

# بلیمەتە بچکۆلەکان، لە پێشەنگای گۆگڵ بۆ زانستەکان




و: محەممەد مێرگەیی

پێشەنگای گۆگڵ بۆ زانستەکان (Google Science Fair)، پێشەنگایەکی ساڵانەی سەر تۆڕی ئینتەرنێتە، بۆ کێبڕکێی قوتابیانی قوتابخانەکانی سەرانسەری وڵاتانی جیهان، ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٣و ١٨ ساڵاندایە. لەو پێشەنگایەدا قوتابییەکان پرۆژە زانستییەکانیان دەخەنەڕوو، بۆ کێبڕکێی بەدەستهێنانی خەڵاتی گەورە کە بەهاکەی بە (پەنجا هەزار) دۆلاری ئەمریکی مەزەندە دەکرێ، ئەمە وێڕای چەندین خەڵاتی دیکەی وەکو پێدانی دەرفەتی خوێندنو ئەنجامدانی گەشتی زانستی بۆ پرۆژە سەرکەوتووەکان.

لە پێشانگای گوگڵی ساڵی ٢٠١٤، هەزاران زانای بچکۆلە بەشدارییان کرد، لەوانەی هێشتا نەچوونەتە خوێندنی زانکۆ، لە پرۆژە زانستییەکانی ئەو بلیمەتە بچکۆلانەش، لیژنەی بڕیاردان ئەو بیرۆکە زانستییە سەرکەوتووانەی هەڵبژارد، کە بە توانایان بۆ گۆڕینی جیهان جیا دەکرێنەوە.

خەڵاتە مەزنەکەی ساڵی ٢٠١٤، سێ کچی ئێرلەندی تەمەن شازدە ساڵان بەدەستیان هێنا، لە بەرامبەر پرۆژەکەیان، کە ئامانجی لەناوبردنی برسێتییە لە سەرتاسەری جیهاندا، لەڕێگەی بەکتریاوە! ئەو سێ زانا کچە بچکۆلانە (سیارا-Ciaraو ئیمێر - Emerو سۆفی - Sophie) جۆرێك لە بەکتریایان بەناوی (دیازوتروف - Diazotroph) بەکارهێنا بۆ خێراکردنی گەشەی هەندێك بەرهەمی کشتوکاڵیی گرنگ، وەکو جۆو زیوان بەڕێژەی ٥٠٪، واتە بەرهەمهێنانی بڕێکی زیاتری ئەو دانەوێڵانە، ئەمەش بەشداری دەکات لە نەهێشتنی برسییەتی لە جیهاندا.

لە وەڵامی پرسیاری هۆکاری گرنگیدانی ئەو کچە بلیمەتانە بەم پرۆژەیە، ئەوان دەڵێن: هۆکاری ڕاستەقینەی ئەمە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو برسێتییەی ساڵی ٢٠١١ کە لە ئەفریقیا ڕوویداو بوو بە هۆی کارەساتێکی مرۆیی گەورە لەو کیشوەرەدا. ئەمە بووە پاڵنەریان بۆ گەڕان بەدوای کرداری پۆزەتیڤانەتر لە بەدواداچوونی هەواڵەکانو بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی قەیرانی کەمیی خۆراك لەسەر ئاستی جیهان.

یەکێك لە پرۆژە زانستییەکانی تری براوەی خەڵاتەکانی پرۆژەی جیاواز، پرۆژەی (Talk)ی قوتابییەکی هیندییە بەناوی (ئارش - Arsh)، ئەم پرۆژەیە ڕێگە دەدات بەو کەسانەی ناتوانن قسەبکەن، کەوا لە ڕێگەی هەناسەدانیانەوە بتوانن قسەو گفتوگۆ ئەنجام بدەن، ئەمەش بەهۆی گۆڕینی هەوای هەناسەدانەوە بۆ چەند هێماو ئاماژەیەك کە ئامێری کۆمپیوتەر دەیان گۆڕێت بۆ قسەو دەنگ. تایبەتمەندیی ئەم داهێنانە جوانە لە هەرزانی نرخەکەیدایە، کە تەنها نزیکەی ١٠٠ دۆلاری ئەمریکییە.

یەکێکی دی لە پرۆژە براوەکان پرۆژەی (ڕۆبۆتە مێش - Flying Robots)ی قوتابی ئەمریکی (میهیر Mihir)ی تەمەن چواردە ساڵان بوو. ئەو قوتابییە ڕۆبۆتێکی داهێناوە، کە دەتوانێت ڕێك بەشێوەی مێشێك بفڕێت. تایبەتمەندیی ئەو ڕۆبۆتە لە بچووکی قەبارەکەیو خێرایییە زۆرەکەیدایە لە هەڵفڕینو نیشتنەوەدا. ئەمە سەرەڕای کۆنترۆڵکردنی بە ئاسانی، ئەمەش وای لێدەکات بەکاربهێنرێت بۆ ئەو ناوچانەی تووشی کارەسات هاتوون، بۆ گەڕان بەدوای زەرەرمەندبووانو ڕزگارکردنیان، هەروەها زانینی قەبارەی زیانەکانی ئەو ناوچانە.

پاڵنەری هەموو ئەو داهێنانە زانستیانەی ئەم زانا بچکۆلانە، ئەوەیە ئەوان خەون بە جیهانێکی جوانتری نوێوە دەبینن، ئەوان کاتێك ئەو گرفتانەیان بینی، کە ڕووبەڕووی کەسانی تر دەبنەوە، نەیانتوانیوە وەکو بینەرێك بوەستن، بەڵکو هەوڵی خۆیان خستۆتەگەڕ —وێڕای بچووکیان لەڕووی تەمەنەوە- بۆ ئەوەی زانستێکو چاکەیەکو هیوایەك دابهێننو پێشکەشی مرۆڤایەتیو جیهانی بکەن.

بەو هیوایەی لە ساڵی ٢٠١٥ دا زانا بچکۆلانەکانی ئێمەی کورد، ببنە خاوەنی ئەم خەڵاتەو داهێنانێکی نوێ پێشکەش بە جیهان بکەن.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ٢٦٧ - ٢٠١٤

وەهاب حەسیب محەمەد

# بازاڕسازی بەستایش

بازاڕسازی کارێکی جووڵاوەو پشت دەبەستێت بە ڕاڤەکردنو پلاندانانو جێبەجێکردنی ئەو بەرهەمو خزمەتگوزارییانەی ڕێکخراوەکە بۆ کۆمەڵگای دابین دەکات، بەڕێوەبردنی بازاڕسازی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو پشت دەبەستێت بە دیاریکردنی چۆنێتیی ئیشکردنی بەڕێوەبەرێتیی ڕێکخراوەکە لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان.

لە دنیای ئەمڕۆداو بەهۆی زۆریی بەرهەمو ڕکابەریی بازاڕەوە، چەندین شێواز بەکار دەهێنرێت بۆساغکردنەوەی بەرهەمو گەیشتنی بەدەستی بەکاربەر، لەوانە بانگەشە، بەگشت شێوەکانییەوە «بینراو، بیستراوو نووسراو» برەوپێدان، وەك داشکاندنی نرخ، خزمەتگوزارییەکانی دوای فرۆشتنو ...هتد.

هەموو ئەو شێوازیانە وەك تێچوون لەسەر خاوەن بەرهەم دەکەوێتو دەبێت بەبەشێك لە تێچوونی بەرهەم؛ خزمەتگوزاری، بۆنموونە کرێی ڕاگەیاندنو...هتد. بەڵام شێوازێکی شاراوەی بانگەشە هەیە، کە زۆرێك لە خاوەن بەرهەمە خزمەتگوزارییەکان بایەخی پێنادەن، یاخود پەی پێنابەن ئەویش پیاهەڵدان، یاخود باسکردنی بەرهەمەکەیە بۆ کڕیارو هەمیشەکڕیار، کە شێوازێکی ئاسانەو بۆ ماوەیەکی زۆر کاریگەری لای کڕیار بەجێ دەهێڵێت.

بازاڕ سازی بەستایش ((Word of Mouth Marketing:

بازاڕسازی بەستایش بەهێزترین جۆری بازاڕسازییەو لە گشت شێوەکانی دیکە زیاتر کاریگەری هەیەو هاوکات هیچیشی تێناچێت.

بێگومان ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵنایات، ئاواش دڵنیابە بازاڕسازی لە ئاستو سنوورێکی بانگەشەو برەوپێدانا ناوەستێت. بەڵکو بازاڕسازی دەورو خولی بارودۆخێك دەدات، کە حاڵەتێکی هۆشەکی لای کڕیار درووست بکاتو ناوبانگی باشی بەرهەم، خزمەتگوزاری، لە ئاوەزی کڕیاردا دروست بکات. تایبەتمەندی وتەکان (ستایشەکان) لە ئاستێکدا ناوەستنو لە سنوورێکدا گیرناخۆن، هەروەها پەیوەستیش نین بەکاتێکی دیاریکراوە، بەڵکو تەنها هێندە ماوەی پێویستە تا کاریگەری دەرکەوێت، لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە ئەگەر کڕیار ڕازی بوو لە بەرهەمێك، یان خزمەتگوزارییەك ئەوا سێ کەس ئاگادار دەکاتەوە، بەڵام گەر بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکەی بەلاوە پەسەند نەبوو، ئەوا لەوەها بارودۆخێکدا، یازدە کەس ئاگادار دەکاتەوە.

بیرمان نەچێت لە بازاڕدا تەنها بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکان ساغناکرێنەوە، بە واتایەکی تر ئێمە لە باڕازدا تەنها کاڵاو شمەك نافرۆشین، بەڵکو بەهاو وبیروباوەڕەکانیشمان دەفرۆشین، بۆئەوەی بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکانمان، لەلایەن کڕیارو هەمیشە کڕیارەکانەوە پەسەند بکرێنو پشتگیریان لێبکرێت، دەبێت باشەو خراپەی بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان باس بکەین، تایبەتمەندیی بەرهەمەکانو ئەو پەیمانانەی دەیدەین بە کڕیار بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانەو بێلایەنانە بۆ کڕیار باس بکرێت، بەشێوەیەك جێگای باوەڕو متمانەی کڕیار بێت. هاوکات پێویستە هەلێکی بێبەرانبەر بۆ کڕیار برەخسێنرێت، بۆ ئەو بەرهەمەی گەرەکێتی بیکڕێت، تا دڵنیابێت لە کواڵێتی بەرهەمەکەو دڵنیابێت بەهای بەرهەمەکە لە نرخی بەرهەمەکە زیاترە وەك: تاقیکردنەوەی بەرهەمەکە، ئەگەر بەرهەمەکە خۆراك بوو، یان تاقیکردنەوەی بەرهەمەکە ئەگەر ئامێرو پێداویستێکانی ماڵ بوو...هتد.

باشترین هۆکار بۆ بڵاوبوونەوەی ناووناوبانگی بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکان، یان کۆمپانیاکان بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆکە ڕاستییە لە بیرکراوانەن، کە کۆتایەکی سەرکەوتوویان هەیە، چونکە خەڵکی حەز بەبیستنی ئەو جۆرە چیرۆکانە دەکەن، وەك ئەو بانگەشەیەی کۆمپانیای (فیدیکس) بۆ بەرهەمەکانی دەیکرد، تەنانەت بۆئەوەی زۆربەی کڕیارو هەمیشەکڕیارەکان گوێبیستی ئەو چیرۆکانە بن، فرۆکەیەکی بەتایبەتی خستبوە ژێر ڕکێفی ئەو دامەزراوەوە، کە ئەو ئەرکەی گرتبوە ئەستۆ، یاخود چیرۆکی درووستکردنی گڵۆپی کارەبایی لەلایەن (ئەدیسۆن)ەوە، کە هەوڵەکانی نۆسەدو نەوەدو نۆ جار شکستی هێناو بۆجاری هەزارەهەم هەوڵەکەی بەری گرتو ئیشەکەی سەرکەوت.

بیرمان نەچێت دەبێت کەسانێك چیرۆکخوانی ئەو چیرۆکانەبن، کە جێگای باوەڕو باوەڕپێکراوبن، تا وتەکانیان سەنگو کاریگەری هەبێت، چونکە دواتر خەڵك تێدەگەنو واهەست دەکەن ئەو قسانەش داوێکی دیکەی داوەکانی بازاڕە بۆ کڕیار، پاش ماوەیەك وتەو بانگەشەکانیان وەك نووسینی سەرلمو سەهۆڵ باهۆزو ڕەشەبای ڕاستی کاریگەرییەکانیان کوێر دەکاتەوە. چونکە لە کۆتاییدا کڕیار پشت دەکاتە بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکان ڕوو دەکاتە بەرهەمو خزمەتگوزارێکانی

کۆمپانیایەکی تر.

بۆ نموونە ئەگەر نرخی بەرهەمێك چەندین جار بەرانبەری بایی بەرهەمە هاوشێوەو ڕکابەرەکانی بێت، بەڵام ئەگەر ئەو بەرهەمە، کەمتر پەکی بکەوێت، یاخود کوالێتی بەرز بێت؛ بۆ نموونە"ئۆتۆمبێلی کۆمپانیاکانی وڵاتی ئەڵمان، بەراورد بە ئۆتۆمبێلی هیندی، کۆری‌و...هتد" ئەوا کڕیار ڕادەهێنرێت بەزۆری، یان بەشێوەیەکی چڕ ئەو بەرهەمە بەهۆی گرانی نرخەکەیەوە بەکار بهێنێت، چونکە کرێکارەکان دەتوانن پاساو بۆ کڕیارەکان بهێنەوە لە گرانی بەرهەمەکەیاندا.

تەنانەت بۆئەوەی بڕیاری کڕینی بەرهەمی کۆمپانیاکە لەلایەن کڕیارەوە زووتر بدرێت، کۆمپانیاکە لەتەك کڕیاراندا ڕێکەوتنێك دەکات، کە کەڵکی ئابووری (جدوى اقتصادي) بەرهەمەکەیان وەك ڕاستییەك بڵاو بکاتەوە.، کە چۆن ئەو کەڵکە (خراپنەبوونی بەرهەمەکە، بەرزی کوالێتی) هۆکاری زیاد بەکارهێنانی بەرهەمەکەیە، بەراورد بەبەرهەمە هاوشێوەو ڕکابەرەکانی. کاتێك ئەو زانیارییانە لەبەردەستی بەکاربەردا فەراهەم بوون، ئەوکات بڕیاری کڕین بەشێوەیەکی خێراو ئاسانتر لەلایەن کڕیارەوە دەدرێت.

ئەم شێوازە لە بازاڕسازی سەردەکێشێت بۆ جۆرێکی دیکە، کە بەبازاڕسازی بەشێوەی وەسیەت (سپاردە) ناودەبرێت (ReferralMarkteing).

مەبەست لە بازاڕسازی بەشێوەی سپاردن بەکێشکردنی کڕیاری نوێیە بەشێوەیەکی خولاوو بەردەوام، لە ڕێگای ناوەندەکانی بازاڕسازییەوە، بێئەوەی لەو نێوەندەدا پشت بە ڕاگەیاندن ببەسترێت، لەم شێوازەدا دووسەرچاوە هەیە پشتی پێدەبەسترێت:

یەکەم: کڕیارانی ئێستا.

دووەم: چالاکی بازرگانی.. کە کۆمپانیاکە پشتی پێدەبەستێت، یاخود تەواوکەری کاری کۆمپانیاکەن وەك: پارێزەرانی کۆمپانیاکە بەکاربەران ڕاسپێرن، کە سوود لە خزمەتگوزارییەکانی ژمێریاران وەرگرن، یاخود ژمێریاران بەکاربەران هان بدەن کەڵك لە خزمەتگوزاریی پارێزەران وەربگرن، ئەگەر پێویستیان بوو، چونکە ئەو دوولایەنە، هاوبەشی ستراتیژین لە کۆمپانیاکەدا.

ئەگەر تەواشایەکی بازاڕ بکەین، دەبینین کەسانێکی زۆر بەرهەم‌و خزمەتگوزاریی باش بۆ کڕیارو کۆمەڵگا دابین دەکەن، بەڵام چونکە نەیانتوانیوە باوەڕ بەکڕیارو بەکاربەرەکانیان بهێنن، کاڵاوشمەك‌و خزمەتگوزارییەکانیان وەك ناووناوبانگ لە ئاستی پێویستدا نین، کەواتە: شێوازی گفتوگۆو وتوویژ لەتەك کڕیارو بەکاربەردا کەمترنییە لە کوالێتی بەرهەم، دەبێت ئەوەشمان بیرنەچێت، ئەم شێوازە هونەری تایبەت بەخۆی هەیە، کە لە زمانپاراویی، ڕاستگۆیی‌و کورتوێژی فرۆشیارداو...هتد دەردەکەوێت بۆ نموونە: نابێت باسکردنی هیچ کاڵاو بەرهەمێك لە سی چرکە زیاتر درێژە بکێشێت، هەروەها شێوازی وەستان بەرانبەر کڕیار تەنانەت جلوبەرگی فرۆشیار لە قەناعەتپێکردنی کڕیارو بەکاربەردا، ڕۆڵی هەیە.

بەداخەوە زۆربەی کات پێچەوانەی ئەو ڕاستیانە دەبینین لە ساغکردنەوەی بەرهەم/ خزمەتگوزارییەکاندا، تەنانەت هەندێجار فرۆشیار زۆر بێمنەتانە هەڵسوکەوت لەگەڵ کڕیاردا دەکات، یاخود بەشێوەیەکی نالۆژیکیانەیەو دوور لەڕاستی"سوێندخواردنی درۆ بەنموونە" کاڵاوشمەکەکانی بەسەر کڕیاردا ساغ دەکاتەوە، ئەوەش هۆکارێکە فرۆشیار نەتوانێت بۆماوەیەکی زۆر لە بازاڕدا درێژە بە کارەکەی‌و ڕکابەری ئیشەکەی بدات.



# ئایا ٢ + ٢ = ٥؟

**و: کاروانی کەریمی**

بەڕێوەبەرێك، پرسیارێکی بیرکاری لە سێ کارمەندی کردو وتی: ئایا ٢ + ٢ = ٥؟

کەسی یەکەم لە وەڵامدا وتی: بەڵێ قوربان، یەکسانە بە پێنج (٥).

کەسی دووەم وتی: بەڵێ قوربان دەکاتە پێنج (٥)، ئەگەر یەکی بۆ زیاد بکەین.

کەسی سێیەم وتی: نەخێر قوربان، هەڵەیە یەکسانە بە چوار (٤).

ڕۆژی دواتر کەسی سێیەم، لەسەر کار دیار نەبوو، بوو بە جێگەی پرسیار، دوای ئەوەی هاوکارەکانی بەدواداچوونیان بۆ کرد، زانییان کەسی سێیەم لە کارەکەی دوورخراوەتەوە.

جێگری بەڕێوەبەر، سەری لەو کارە سوڕما، لە جەنابی بەڕێوەبەری پرسی: بۆ کەسی سێیەمت لە کار دوورخستەوە.

بەڕێوەبەر لە وەڵامدا وتی: کەسی یەکەم درۆزنە، خۆشی دەزانێ کە درۆزنە، بەڵام بۆ کاری ئێمە، ئەو جۆرە کەسانە خوازراوو پێویستن.

کەسی دووەم کەسێکی زیرەکە، خۆشی دەزانێ زیرەکە، بەڵام ئەو شتانەی پێی ڕازی نییە، پەردەپۆشی دەکات؛ ئەویش بە کەڵکی کاری ئێمە دێت!

سەبارەت بە کەسی سێیەم، کەسێکی ڕاستگۆ بوو، دەیزانی کە ڕاستگۆیە، ئەو شتەی پێی ڕازی نەبێت، ڕاشکاوانە دەریدەبڕێت، جا بزانە ئەو جۆرە کەسانە بەڕێوەبەر ماندوو دەکەنو کارکردن لەگەڵیاندا قورسە، بە کەڵکی کاری ئێمە نایەن!

پاشان بەڕێوەبەر ڕووی کردە جێگرەکەیو وتی:
ئایا ٢ + ٢ = ٥؟

جێگرەکەی وتی: قوربان قسەکانتم بەباشی گوێ لێبوو، بۆم شی ناکرێتەوە، کەسی وەك من، ناتوانێ قسەی زانایەکی وەك جەنابتان شیبکاتەوە.

بەڕێوبەرەکە لە دڵی خۆیدا وتی: ئەمیش دووڕووە، ئەم جۆرە کەسانە خۆشەویستو لەبەردڵانن.

سەرچاوە: مدونة المختلفون




ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# خۆپاراستن لە نەخۆشییە باوەکان

# سێیەم: بەرزبوونەوەی چەوریی خوێن

لەم سالانەی دواییدا، خەلکی هاواریان لێهەستاوەو داوای بەرەنگاربوونەوەی کۆلیسترۆڵو چەوری دەکەن، لەبەر ئەم بابەتە، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، وتارو کۆڕەکان، چەندین بابەتیان لەمبارەیەوە لەخۆگرتووە.

ئەوەی ڕاستی بێت؛زیاد لە نیوەی دانیشتووانی ولاتە خۆشەویستەکانمان، تووشی بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵی خوێن بوون! بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵی خوێن؛ یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی تووشبوون بە جەڵدەی دڵ.

١- کۆلیسترۆڵ چییە؟

کۆلیسترۆڵ ماددەیەکی چەورییە، کە بە شێوەیەکی سرووشتی لە خانەکانی لەشدا هەیە، یەکێکە لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی خانە، هەروەها پێکهێنەرێکی سەرەکیی هەندێك لە هۆرمۆنەکانی وەك (کۆرتیزۆنو هۆرمۆنە سێکسییەکان)و ماددە بنچینەییەکانی لەشی وەك (ترشە زەرداو - Bile acids)، کە لە ڕیخۆڵەکانەوە، یارمەتی مژینی چەوریی دەدات.

**کۆلیسترۆڵ لە لەشی مرۆڤدا لە دوو سەرچاوەوە بەدەست دێت:-**

* یەکەم: لە ڕێی ئەو خۆراکانەی دەیانخۆین. وەك: گۆشتو هێلکەو شیرەمەنییو پەنیر.

* دووەم: ئەندامی جگەرمان خۆی کۆلیسترۆڵ دروست دەکات.

واتە هەموو ئەو کۆلیسترۆڵەی لە خوێنماندایە، لە خۆراکەوە بۆمان نایەت، بەلکو دوو لەسەر سێی لە ڕێی لەشی خۆمانەوە دروست دەکرێت، بمانەوێت، یان نەمانەوێت.. خوێن کۆلیسترۆڵ هەڵدەگرێت بۆ بەشە جیاوازەکانی لەش، ئەگەر بڕەکەی لە ئاسایی زیاتر بوو، ئەوا مانای تووشبوون بە نەخۆشی دەگەیەنێت.

٢. جۆرەکانی چەوریی خوێن:

أ. چەورەپرۆتینی چڕیی بەرز- High Density Lipoprotein(HDL): جۆرە بەسوودەکەی کۆلیسترۆڵی پێدەوترێت، هەتا ئەم جۆرە بڕەکەی زیاتر بێت لە خوێندا، ئەوا ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشیی خوێنبەرەکانی دڵ کەمترە.

لەو هۆکارانەی ئەم جۆرە بەسوودەی کۆلیسترۆڵ زیاد دەکات: دابەزاندنی کێش، ئەنجامدانی وەرزشو وازهێنان لە جگەرەکێشانە.

.. چەورەپرۆتینی چڕیی نزم- Low Density Lipoprotein (LDL):جۆرە زیانبەخشەکەی کۆلیسترۆڵی پێدەوترێت، ئەم جۆرەی کۆلیسترۆڵ لە جگەرەوە بۆ خانە جیاوازەکانی لەش دەگوێزرێتەوەو دەبێتە هۆی مەیینی چەوریی لە نێو دیواری خوێنبەرەکاندا، ئەمەش سەر دەکێشێت بۆ تەسکبوونەوەی خوێنبەرەکانو ڕەقبوونیان، ئەگەر ئەم ڕووداوانە لە خوێنبەرەکانی دڵدا ڕوویدا، ئەوا سەردەکێشێت بۆ سنگەکوژێ، یان جەڵدەی دڵ.

لەبەرئەمەیە، کە زۆر پێویستە پشکنینی ئاستی چەوریی لە خوێنتدا، ئەنجام بدەیت.

٣- ئامۆژگارییەکان بۆ خۆپاراستنو چارەسەرکردنی بەرزیی چەوریی خوێن:

* ئەو بەرهەمە شیرەمەنییانە بخۆ، کە ئاستی چەورییان نزمە.

* کەمکردنەوەی خواردنی گۆشتی سوور، لە جیاتی ئەوە گۆشتی سپی بخورێت (ماسیی-مریشك).

* لێکردنەوەی بەزو چەوریی لە گۆشتی سوورو لێکردنەوەی چەرمی پێستی مریشكو ماسی.

* دووربکەوە لە خواردنی گۆشتی کارگەکان (مەسلەحە)، کەلە خواردنگەی ژەمە خێراکاندا زۆر بەکاردێت.

* کولاندنی گۆشت، لە برژاندنی، یان سوورکردنەوەی، باشترە.

* تا بکرێت سوورکردنەوەی خۆراك بەرۆن، یان بەزەیت کەم بکرێتەوە.

* زیاد خواردنی سەوزەواتو میوەکان، بەتایبەت ئەوانەی دەوڵەمەندن بە ڕیشاڵەکان.

* دووربکەوەرەوە لە خۆراکە پڕچەورییەکانی وەك شیرینییەکانو شوکولاتەو پسکیتە چەورەکان... هتد.

* کەمکردنەوەی خواردنی شەکر لە خواردنەوەو شیرینییەکانو بێدارکەرەوەکان؛ وەك: چاو قاوە، بەپێی توانا.

# سوودەکانی کاهو



کاهـوو، یەکێکـە لـەو سـەوزانەی، کـە ڕێژەیەکـی زۆر ڤیتامینیـی تێدایـە، بە تایبەتی ڤیتامیـن (C) لەگەڵ نزمی لە یەکـەی گەرمیدا، هەروەهـا دەوڵەمەندە بە خـوێ کانزاییەکان، بەتایبەتـی تفتەکانیان، ئـەوەش یارمەتیـی نزمکردنەوەی ئەو ترشـییەی لە ئەنجامی خواردنی چەورو ترش پێکدێت، یارمەتی خاوێنکردنەوەی خوێنو تەندرووستی لەش بە گشتی دەدات.

کاهـوو بە یەکێك لە گرنگترینـی ئەو بەرهەمانە دادەنرێت، کـە لە هەموو شـوێنێکی جیهاندا، دەکرێتە زەڵاتـەوە، هەروەها لە ئامادەکردنی لەفەی هەمبەرگرو شـاورمەو چەند خواردنێکی دیکەدا بەکار دێت، هەندێجار گەڵای کاهوو، تامێکی تاڵ دەبەخشێ، بـەڵام گرنگی مادده خۆراکییەکانی ناوی، ئـەو تاڵییە فەرامۆش دەکات.

سوودەکانی کاهوو:-

١- کۆڵۆن:- لەبەرئەوەی کاهوو، سلیلۆزی تێدایە، خواردنێکی باشـە؛ بۆ باش بەڕێوەبردنی کردارەکانی هەرسو گواسـتنەوەی خۆراك لەناو ڕیخۆڵەکاندا، لەبەرئەوە بۆ تێکچوونی گەدەو قەبزی بـەکار دێت، هەروەها تێکەڵەی شـەربەتی کاهـوو، لەگەڵ لیمۆو ئاوی نەعناو هەنگوین، لە چارەسـەری بەدهەرسـیو هێڵنجدانو ڕشانەوەدا بەکاردێت.

٢- کەمخوێنی:-

زۆریی ڕێژەی ئاسن لە کاهوودا، یارمەتیی هیمۆگلۆبینی خوێن دەدات، لەبەرئـەوە وەك چالاککـەرەوە بەو نەخۆشـانە دەدرێت، کە بەدەسـت کەمخوێنییەوە دەناڵێنن؛ چونکە کار دەکات لەسەر مژینی ئاسنو خوێنیش بە ئاسن دەوڵەمەند دەکات.

٣- بـۆ ئافرەتی دووگیان:- ترشـی فولیك "فولیك ئەسـید" یەکێکـە لـەو پێکهاتانەی لە کاهـوودا هەیە، یارمەتی پاراسـتن لـە کەمخوێنی دەدات لە کاتی دووگیانیدا، یارمەتی پاراسـتن لە دووبـارە لەبارچـوون دەدات، ئەوەش کاریگەری دەبێت لەسـەر دەردانی هۆرمۆنی پرۆجیسـترۆن، کە بەرپرسـە لە دابینکردنی ڕژێنی شـیر لەلایـەن ئافرەتـەوە، دوای دووگیانیـش، دایکەکە بـۆ زۆربوونی شـیر دەتوانێت کاهوو بخـوات، ئەویش لە ڕێگەی کوڵاندنی کاهووەکەو لەگەڵ خوێو بیبەرو ئاوی لیمۆ.

٤- سوودی بۆ قژ: قژیش هەروەك لەش پێویستی بە ماددەی خۆراکـی هەیە، کاهـوو کۆمەڵەیەکی فراوان لـە ڤیتامینو کانزا پێویستەکانی گەشـە پێشکەش بە قژ دەکاتو زۆر بەسوودە بۆی لە دوو ڕووەوە:-

یەکەم: هاندانی گەشەی قژ: بە خواردنەوەی شەربەتی کاهوو، گەشەی قژ زیاد دەکات، چونکە ڕەگی مووەکە بەهێز دەکات.

دووەم: زیاتر زیندووهێشتنەوەی قژ: بەهۆی بوونی سلیکۆنو فسفۆرو گۆگرد، یارمەتیدەرە بۆ زیندوو هێشتنەوەی قژو پێستو نینۆکەکان.

٥- سـوودی بۆ پێست: کاهوو، چاڵو زبری پێسـتی دەموچاو ناهێڵێـت، دەتوانرێـت کاهـوو بـۆ مـاوەی ١٠ خولـەك دابنرێت، بەشێوەیەك کاهووەکە بە ئاوی پێویست دابپۆشرێ، پاشان بەو ئاوە دەموچاو بشـۆردرێت، کێشەی زیپکەو سـوتانی بەر خۆر چارەسەر دەکات، یاخـود دەتوانرێـت ماسـك بۆ دەموچاو دروسـت بکرێت، بێئـەوەی ماددەی کیمیایی بـەکار بێت، ئەویش لە ڕێی کەوچکێکی گەورەی زەیتی زەیتون بکرێتە دەفرێکەوە، پاشان کەوچکێکی بچووك ئـاوی لیمۆی تێکەڵ بکرێت، دوای ئـەوە کاهووەکە پارچە پارچەی ورد دەکرێـتو تێکەڵی زەیتی زەیتوونەکەو ئاوی لیمۆکەی دەکەین، ئینجا لە دەموچاو دەدرێت بۆ ماوەی٢٠ خولەك، پاشان لادەبرێت.

٦- سوودی بۆ سەر ئێشەو خەو زڕان:-

کاهوو ماددەی "لیستوکاریام"ی تێدایە، یارمەتی کەمکردنەوەی خەو زڕان دەدات، لەبەرئەوە بەکاردێت بۆ ئەو نەخۆشانەی بەدەست خەوزڕانو سەرئێشـەوە دەناڵێنن. ساڵی ٢٠١١ چەند لێکۆڵەرێك لە نەخۆشخانەی (العمورە) بۆ نەخۆشییە دەروونییەکانو کۆمپانیای فارکـۆی تایبەت بە دەرمان ڕایانگەیاند، کەپسـولی زەیتی کاهوو "ئگم" چارەسـەرێکی کاریگەرە بۆ نەهێشتنی خەوزڕان، هەروەها لێکۆڵـەرە میسـرییەکان دەڵێن: زەیتی کاهوو، زۆر بەسـوودە بۆ خەوزڕانو ڕاڕایی، بێئەوەی هیچ کاریگەرێکی نەرێنی هەبێت.

بە شێوەکی گشتی، کاهوو زۆر بەسوودە بۆ لەش؛ بەهۆی بوونی بڕێکی زۆر باش لە کانزاکانی ئاسـنو کالیسـیۆمو مەگنیسـیۆمو پۆتاسیۆم، ئەمانەش زۆر گرنگن بۆ هاوسەنگکردنی خوێکانی ناو لەش، هەروەها پۆتاسیۆم بە گرنگترینی هۆکارەکان دادەنرێت، کە ڕۆڵ دەبینێت لە کۆنترۆڵکردنی لێدانەکانی دڵو فشاری خوێن.

زیانەکانی کاهوو:

زۆر خواردنی بە شـێوەیەکی زۆرو بەردەوامو زیادەڕۆییکردن تێیـدا، دەبێتـە هۆی ڕەنگـی دەموچاو بگۆڕێـت، بەهۆی بوونی بڕێکی زۆر لە بێتاکاربۆن، ئەو ڕەنگەش نامێنێ بە کەمخواردنی، بە شـێوەیەکی گشـتی، هیچ کاریگەرییەکی دیکـەی نەرێنی، لە خواردنی کاهوودا نییە.

# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

**لایەنە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی دوودا چاویان بە دونیا هەڵهێناوە:**

١- حەز بە ژیانی واقیعیو نموونەیی دەکات، لە خەیاڵو ژیانێکی دوور لە واقیعدا ژیان ناگوزەرێنێت.

٢- کەسێکی خاوەن بەهرەو زیرەکە.

٣- لەسەر سروشتی خۆی مامەڵە دەکات، واتە تەمسیلو خۆنواندنی نییە.

٤- کەسێکی ئارامو شەرمنو خۆبەکەمزانەو لە خۆباییو فیزاویی نییە.

٥- زیادەڕۆیی لە کەسایەتی خۆیدا ناکات.

٦- لە ئەمانەتپارێزیو هۆگریدا بۆ کەسانی بەرامبەر، چێژ دەبینێت.

٧- خاوەنی ویستو ئیرادەو پلانی بەهێزە، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی.

٨- حەز بە سەربەستیو ئازادی دەکات، دژی کۆتو بەندو ژێر دەستەییو شوێنکەوتنی کوێرانەیە.

٩- بە توندی ڕووبەڕووی ئەو کەسان دەبێتەوە، کە ڕەخنەی لێ دەگرن، یان بەرهەڵستی دەکەن، واتە متمانەی بە خۆی هەیە.

١٠- گرنگی بە شتی لاوەکی نادات، سەرنجی لە سەر شتە ئەساسییەکان چڕ دەکاتەوە.

١١- حەز بە دروستکردنی هاوڕێیەتی دەکات، بەڵام زۆر بەدگمەن دەریدەبڕێت.

١٢- کەسێکی بوێرو ئازاو دلێرەو گەشبینە بە ژیان.

١٣- سەبارەت بە هیواو ئاواتەکانی کەسێکی واقیعییە، واتە هیواو ئاواتی دوور لە واقیع، کە بەدیهێنانیان ئەستەم بێت، ناخوازێت..

١٤- حەز بە چێژوەرگرتنو خۆشگوزەرانی دەکات.

١٥- کەسێکی ڕۆمانسییە، بەڵام زۆر بە حەزەرەوە ئەو هەستەی دەشارێتەوە.

١٦- دەزانێت چۆن هەستو سۆزی بۆ بەرامبەرەکەی دەربڕێت.

**لایەنە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی دوودا لەدایکبوون:**

١- بیرۆکەکانیان سادەو ساکارن.

٢- کەسایەتی جێگیر نییەو بە پێی بارودۆخ کەسایەتی دەگۆڕێت، دەتوانین سادەتر بڵێین: کەسێکی مەزاجییە.

٣- کەسێکی زۆر هەستیارە، لە هەمان کاتدا بە شتی زۆر سادەو ساکار هەستی بریندار دەبێت.

٤- بە شتی سادەو ئاسان تووڕە دەبێت، واتە بە ئاسانی تووڕەبوونی خۆی دەردەخاتو ناتوانێت تووڕەبوونی بشارێتەوە. لە هەمان کاتدا کەسێکی ئینکارە، واتە پێداگری دەکات لەسەر ئەو شتەی کە بە بۆچوونی خۆی ڕاستە.

٥- خاوەنی هەندێك بیروباوەڕی نامۆیە، واتە هەندێك بۆچوونی هەیە، کە نامۆیە بە کەلتووری کۆمەڵگەکەی.

٦- دەستبڵاوە لە خەرجکردندا، واتە: بەشێکی سامانەکەی لە شتگەلێکی ناپێویستدا بە هەدەر دەبات.

**پوختە:** ئەگەر سەرنج بدەین لایەنە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی دوودا هاتوونەتە ژیان. زۆر زیاترە لە لایەنە نەرێنییەکان، کەواتە: بە هەوڵدانو تێکۆشانو ماندووبوون، دەتوانیت لایەنە نەرێنییەکان، لەوەش زیاتر کەم بکەیتەوەو هاوکات لایەنە ئەرێنییەکان پتەوترو بەهێزتر بکەیتو ڕێژەیان زیاتر بکەیت.. بەو هیوایەی هەمووان بتوانین گەشە بە لایەنە ئەرێنییەکان بدەینو لایەنە نەرێنییەکان کەم بکەینەوەو هەوڵی نەهێشتنیان بدەین.



# لەگەڵ خۆتدا

زاهیر زانا

ڕەنگە هەر کەسێك لە ئێمە، زۆرجار لەگەڵ خۆماندا قووڵبووبینەوەو بەناو دوورگەکانی ناخی خۆماندا گەڕابینو کەوتبینە وتوێژ لەگەڵ ناخو دەروونی خۆمانو کۆمەڵە پرسیارێکمان لە خۆمان کردبێت، یاخود کۆمەڵە وەڵامێکمان دۆزیبێتەوە، کە وێڵو عەوداڵ بووین بەدوایانداو هەستێکی سەراپا لە شادمانی دایپۆشیبین، یاخود بۆ وەڵامی پرسیارەکان، پەرۆشو بەجۆشوخرۆش بووینو بوونەتە تەڵتەڵەی بیرو هۆشمانو تەنگیان پێ هەڵچنیبێتین تا بەدوایاندا بگەڕێین، زۆرجار گەورەییو هۆشیاری مرۆڤیش لە پرسیارەکانییەوەیەتی، یاخود لە هیواو ئاواتو ئامانجەکانییەوە.

مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە کاتێکی هەبێت کە بەناو دەروونی خۆیدا قووڵ ببێتەوەو پشوویەك بداو خۆی بدوێنێو باخچەی دەروونی خۆی بژار بکاو هەمیشەو هەردەم سەرقاڵی ناشتنی نەمامی بەبەرهەمو بۆنخۆش بێ تێیداو منداڵی دەروونی خۆی پەروەردە بکا لەسەر شتە جوانو بەنرخەکانو ببێتە مامۆستای خۆیو ئەوەی دەیەوێت لە گەردووندا بیبینێت، سەرەتا لە دڵی خۆیدا بیچێنێتو لە خۆیەوە دەست پێ بکات، لەبەرئەوەی هەر پرۆژەو بەرنامەیەك، لەسەر خۆت جێبەجێی نەکەیت، ئەستەمە بتوانیت، کەسێکی تری لەسەر پەروەردە بکەیت، یاخود بە دەوروبەردا، بڵاوی بکەیتەوە، وەك گڵۆپێك ئەگەر خۆی نوورو ڕووناکییەکی نەبێت، چۆن دەتوانێت بیبەخشێت، وەك شاعیریش دەڵێت: (چرا ڕووناکی بۆ ژێری خۆی نییە، ڕەحمەت لە با بیبا). واتە: گەر چرایەك ژێر خۆی ڕووناك نەکاتەوە، هەر بکوژێتەوە باشترە، مرۆڤێکیش گەر خۆی درووست نەکردبێتو خۆی نەناسیبێت، بوونو نەبوونی زۆر جیاوازییان نییەو بێسوودو بێکەڵك بۆ خۆیو دەوروبەری دەمێنێتەوە، هەروەك دەڵێن: (مَنْ لَمْ يَكُنْ لِنَفسِهِ، فَكيفَ يَكونُ لِغَيرِه). بێگومان وایە؛ ئەوەی بۆ خۆی هیچی پێ نەبێت، بۆ دەوروبەریشی هیچی پێ نابێت؛ لە کاسەی خاڵی هیچ نارژێت، لە گیرفانو بیری بەتاڵ، هیچ نایەتە دەرەوە، بە حەڵوا حەڵوا، دەم شیرین نابێت. بەڵکو دەبێت هەوڵو تێکۆشانو کرداری لەگەڵدا بێت، سەرەتا خۆمان بناسینو خۆمان درووست بکەین، ئەوجا دەتوانین کاریگەریمان لەسەر دەوروبەریش هەبێت، کەسێك، کە ئاگای لە خۆی نەبێت، ئەوا خۆی ونکردووە، تواناکانی ناناسێت، بێ بەهرەو بەخشش دەمێنێتەوە، هەروەك چۆن مەحوی، سەری بێجۆشوخرۆش، هەستونەست، محەبەت، جوانویستیو چاکخوازی، بەشووشەی بەتاڵ شوبهاندووە، سەری بێ بیرو فیکرو بەهرەو بەرهەمو داهێنانیشی، بە زرکە تاڵ چواندوە:

دڵ، کە جۆشێکی نەبێت، شووشەی بەتاڵم بۆ چییە
سەر، کە هۆشێکی نەبێت، من زرکە تاڵم بۆ چییە؟!

بێگومان ئێمە بەلایەنە مەعنەوییەکانەوە جوانو بەهێزو بەختەوەرو سەرکەوتووین، بووین بە سەرداری گشت بوونەوەران، چەندێك ئەو لایەنانە بەهێزتر بکەین، مرۆڤبوونمان پتەوترو پتر ترە.. چەندێ فەرامۆشیان بکەین، لە ئاستی ڕێزو قەدرمان دێتە خوارەوە، لاوازو زەبوون دەبینو لە خودی خۆماندا شکست دەهێنین، کە گەورەترین قەیرانە، بەچی دەچێ؛ مرۆڤ هەموو دنیا بەرێتەوەو خۆی بدۆڕێنێت، یاخود هەواڵی لە بچووکترین شتەکانی سەر زەوی هەبێت، بەڵام لە خۆی بێئاگابێتو ناخو دەروونی خۆی نەناسیبێت، بێئامانج، سەرلێشێواو، نیگەرانو پەرێشان بێ، کاتێك مرۆڤ کۆمەڵێك لایەنی مەعنەوی هەبێت، کە لەپێناویاندا بژی، ڕۆحو دڵو دەروونی خۆی پێ شاد بکات، چێژ لە بوونی وەربگرێت، هەست بکات ئەرکێکی گەورەی ئەخلاقیی سەرشانی خۆی جێبەجێ کردووە، بەبوونو وجودی خۆی ڕازی بێ، قەدری ئەو هەموو بەخششو ڕێزە بگرێت، کە پەروەردگار پێی بەخشیوە، تواناکانی خۆی بناسێتو لە خزمەتی چاکەو چاکەکاریدا بەکاریانبهێنێت، باری لاری کەسێك ڕاست بکاتەوە، خەندەیەك ببەخشێتو خەمی دڵی کەسێك بتەکێنێت، ئەوا دەرگاکانی بەختەوەری بەسەر خۆیدا کردۆتەوەو سەرکەوتووەو ئەرکی مرۆڤانەی خۆی جێبەجێ کردووە، بۆیە زۆر پێویستە هەر کەسێك لە ئێمە؛ ڕۆژانە ساتێکی هەبێت، کە بە دەروونی خۆیدا بچێتە خوارەوەو لایەنە نەرێنیو خراپەکانی ژیانی، کەم بکاتەوەو تۆزی سەر دڵی بتەکێنێتو ویژدانی وریا بکاتەوەو خۆی پڕ بکات لە هەستی ئیجابیو هاوکاریو مرۆڤدۆستی، خۆی بارگاوی بکات بە هیواو بڕواو بۆ ئایندەیکی گەش بڕوانێت.

# «کۆڵنەدان، سەیرو سەمەرەکان دەخوڵقێنێت»

ن: د. عبدالکریم بکار/ و: ئاسیا صەلاح

کچو کوڕەکانم، گەر چاوێك بخشێنن بە سەرگوزشتەی پیاوانو ئافرەتانی مەزندا، دەبینین کە لە چەندان خاسییەتو سیمای باشدا هاوبەشن، هەر ئەوەشە ئەوانی کردۆتە کەسانێکی مەزنو باش، لە نێو ئەو خاسیەتانەدا یەکیان (کۆڵنەدان)و توانای بەردەوامییە لە کاردا؛ چونکە هەر کارە بچووکەکانن لە بەردەوامیدا کۆدەبنەوەو دەبنە کارێکی ئێجگار مەزن، هەمووتان دەزانن، کە تەنۆلکەکانی دڵۆپەئاوێك چی دەکات لە بەردێکی ڕەق، کە بە بەردەوامبوونی چەندان کەلێنی تێدا هەڵدەکەنێتو شێوەی دەگۆڕێت. شەیتان زۆرینەی هەوڵەکانی چڕکردۆتەوە؛ لە ڕێگریکردنمان لە بەردەوامبوون لەکارە باشو بەسوودەکانو سەرقاڵکردنمان بە ڕابواردنو کارێك، کە هیچ خێرێکی تێدا نییە، خودای گەورەش فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کردووە؛ کە تا دواساتی ژیانی پەرستشەکانی ئەنجام بدات، وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴾ الحجر: ٩٩ واتە: «تا مردنت دێت خوای پەروەردگاری خۆت بپەرستە»و پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: «هەرکەسێك شەو خەوی لێکەوتو چەند ئایەتێکی قورئانی نەخوێند، ئەوا با لە نێوان بەیانیو نیوەڕۆدا بیخوێنێت، پاداشتەکەی وەك ئەوەیە لە شەودا خوێندبێتی». موسوڵمان جەختدەکاتەوە لەسەر ئەرکە سوننەتو خێرەکان لە شەودا، ئەگەر بەهەر هۆکارێك، یەکێك لەمانەی لەدەستچوو، لە سەرەتای ڕۆژەکەیدا قەرەبووی دەکاتەوەو ئەنجامی دەداتەوە، بۆئەوەی بیسەلمێنێت، کە نەبەزێنراوەو پاشگەزیش نەبۆتەوەو لە زووترین کاتیشدا توانای ڕاستکردنەوەی ئەوەی هەیە، کە لەدەستی داوە، هەر لەبارەی ئاگاداری لە گەڕانەوە بۆ تاوانکردنو پاشگەزبوونەوەو لە دەستدانی بەردەوامی لە پەرستشەکاندا، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، کە پێی فەرمووە: «عبدالله وەك فلان کەس مەبە؛ شەوانە هەڵدەستا، بەڵام دواتر هەستانی شەوانی واز لێ هێنا».

ئەمە چی دەگەیەنێت لای کچو کوڕەکانم؟

١. خۆتان ڕابهێنن لەسەر داواکردنی یارمەتی لە خودای باڵادەست، بۆ هەموو کارێك لە کارەکانتان.

٢. با هەر یەکێکتان چەند کارێکی ڕۆژانە بۆ خۆی ڕێك بخات؛ وەك: پەرستشو خوێندنەوەو هەندێك کاری چاکەو هەوڵ بدات ئەوەی خۆی لەسەر ناچاردەکات، لە تواناو وزەی ئەودا بێتو خۆی بە دووربگرێت لە زیادەڕۆیی، تا نەکەوێتە بێزاریو شکستەوەو بیانووی کەوتن لە خۆیدا نەهێڵێت.

٣. هەوڵی هاوەڵایەتیی کەسانێك بدەن، کە خاوەن خواستی بەرزو خۆڕاگریین، تا ئێوەش لێیان وەربگرن.

٤. بەرپەرچی ئەو وەسوەسانەی شەیتان بدەنەوە، کە ئاماژە بە وازهێنان دەکات لە کارێكو خۆتانی تێدا ماندوو بکەن.

٥. خوو بگرن بە قەرەبووکردنەوەی ئەو کاتژمێرانەی لە دەستتان دەچێت لە خوێندنەوەو کاری خێرخوازی، ئەمەش لە ڕێگەی پەروەردەکردنی ناخو ڕاهێنانی لەسەر ئارامگری.

٦. چەند سزایەك دیاری بکەن بۆ خۆتان بۆ هەر کاتێك، کە کەمتەرخەمیتان کرد، لە جێبەجێکردنی ئەوەی پەیوەستن پێوەی، وەك: کەسێك کە کاتژمێرو نیوێك دەخوێنێتەوە لە بەرامبەر کەمتەرخەمیکردنی لە خوێندنەوەیدا بۆ ماوەی کاتژمێرێك.

٧. لە وەرگێڕدراوەکاندا ئەوانە بخوێننەوە، کە داهێنانی گەورەیان ئەنجامداوە، تا ئەو هۆکارانەیان لێ فێربن، کە توانای سەرکەوتنی پێداون بەرەو لوتکە.

٨. لەسەر نزیکبوونەوەتان لە خودای گەورە مەدوێن، لەبەردەم خەڵکیدا، تا خۆتان لە ڕووپامایی بپارێزن.



# چۆن هاوسەنگیی ژیانو خۆشبەختیت دەکەیت؟

نووسینی: براین تریسی
و: هێشوو والی

کاتێك خەریکیت گەشــە بە ژیانــت دەدەیت، دەتەوێت چۆن گەشەیەك بێت؟ ئایا لەڕاستیدا دەتەوێت ببیت بە چی؟ لەوانەیە ئەمە پرســیارێکی ئاســایی بێــت، تەنانەت ئەگەر پرســیارێکی بێنرخیــش نەبێــت بەلاتەوە، بــەڵام ئەمە گرنگــی خۆی هەیە، لەوانەیە فرمان بە دڵت بکات بۆ بڕیاردان بۆ بەجێهێنانی، ئەگەر لەهەر کاتێکی تەمەنتدا بووبێت.

هاوســەنگیی ژیان: ئامانجەکەت «پێویستە» دڵخۆشت بکات، بڕیــاردان بــۆ دەســتپێکردنی ژیانێکی ڕاســتەقینە، گرنگترینە، دەســتپێکردن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکــەتو بەدیهێنانی بخەیتە ئەستۆی خۆتو پاراستنی هاوسەنگیی ژیانت.

بەگشــتی ئامانجەکانت دڵخۆشــت دەکــەن. ئامانج هێمنت دەکاتــەوە، باوەڕبەخۆبوونــت زیاد دەکات، پشــووت پێدەداتو هەســتی کۆنترۆڵکردنــی خۆتت لە هەمــوو ڕوویەکی ژیانەوە پێــدەدات. ڕێك وەکــو لێخوڕینــی ئۆتۆمبێلــی تایبەتی خۆت وایــە؛ چونکە کاتێك ئۆتۆمبێلەکەت بچوکتربێت، وزەی کەمتر بەکاردەهێنێت، بەڵام ئەگەر ئۆتۆمبێلێکی وەك پاس بێت، وزەی زیاتری دەوێت، تا هــەردوو ئۆتۆمبێلەکە هەمان دووری ببڕن، بەمجۆرە تۆ پێویســتت بە وزەی کەمتــرە، بۆئەوەی خێراترو دوورتر بڕۆیت، پێویســتە باشترین شــێوەو بیرۆکەو هەستو ئامانجت دیاری بکەیتو بەمشێوەیە شتە بەهادارەکانت هەر بە بەها دەمێنێتەوە.

لە لایەکی دیکەوە، بنچینەیەکی سروشــتیت هەیە، کە بەرەو خۆشبەختی دەتبات. لەڕاستیدا چاودێرێکی ئاسایی بۆ هەرکەسێك، کە لە ناختدا هەیەو کاتێك کارێك ئەنجام دەدەیت، کە ئەو کارە لەگەڵ کەســایەتیتدا دەگونجێت، یان نا پێت دەڵێت، ئەوە دەنگی ناختو ژیریی تایبەت بەخۆتە، ئەمەش مێشکت ئارام دەکاتەوە.

ژیانێکی دڵخۆشانە بژی: باری سروشتی لە ژیاندا هەر هەبووە ئەمانە شــتانێکن، کــە تایبەتن بە خۆت، ژیانــی تایبەتیت، سروشــتت، تەندرووســتیت.. هتد، ئەمانە لە ژیانتدا پێویستیان بە هەبوونی ئەزموونە، تا بەهۆیانەوە خۆشــی وەربگریتو پێیان دڵخۆش ببیت، ئەوە گرنگترین شتە لە هەر کارێکدا، کە دەتەوێت ئەنجامــی بدەیــت. بەهۆی ئەمانەوە، کە باســمان کــرد، پێکەوە یارمەتیت دەدەن، تا کەسایەتی تایبەت بەخۆت بەدەست بهێنیت.

بزانــە بــە هــۆی چ شــتێکەوە زۆر دڵت خــۆش دەبێت، کە لەچواردەورت ڕوو دەدەن، لە ڕاســتیدا، بە چەندێتی دڵخۆشــانە ژیانو هەبوونی زیهنێکی ئەرێنی درووست دەبێت، ئەمیش بەهۆی بەرگەگرتنی خۆشیو ناخۆشییەکانی ژیانەوە. ئەمانە پێوەرن بۆ زانینی تەندرووستی لایەنی دروونیت.

چۆن دڵخۆش دەبین: بەدوای کردارە باشــەکانی دەوروبەرتدا بگەڕێ.

بە باشــترین ئاســت، دەبێت درێژە بدەیت بە گەشــەپێدانی ئــەو خووەت، کە بــەدوای کردارە باشــەکانی خەڵکداو بارودۆخو هەڵوێســتە جوانەکانــی چواردەورتــدا دەگەڕێیــت.. هــەوڵ بدە ناباشــییەکانی دەوروبــەرت، نەبینیــتو گرنگیــان پێنەدەیــت. دەبێت ئــەوە بدۆزیتەوە چۆن دڵخۆش دەبیت، لەگەڵ ئەویشــدا هەوڵــی فێربوونی ســوودوەرگرتن لــە هەمــوو ناڕەحەتییەکان، کــە ڕووبەڕووت دەبنەوە ببە. بەتــەواوی کۆنترۆڵی ژیریت بکە، بەمشــێوەیە زۆر بە گەشــبینانە جیهان دەبینیت، کە ســەیری جیهانەکــەی خۆت دەکەیت، دەبینیت بەو شــێوەیەیە، کە خۆت دەتەوێــت، تــەواوی جیهانەکــەت دەبینیــت، وردە وردە زیاترو زیاتر بەرەو هاوسەنگییەکەی تۆ دێت، کەواتە بەو جۆرە ژیانەی دەتەوێت بژی.

دەست پێبکە:

لە ئەمڕۆوە دەســت پێبکەو بڕیاربدە دڵخۆشــبیت. ســەیری باشــییەکانی ئەوانی دیکە بکەو شــادی لــەو کارانەی ئەنجامیان دەدەیــت بــدۆزەرەوە.. کاتێــك بڕیــاری دڵخۆشــبوون دەدەیت، هاوســەنگیی ژیانتو خۆشــیو شــادییەکی نــوێ دەدۆزیتەوە لە ژیانتدا.

# وەڵامی بەجێ

* حوسنی موبارەكو نەخۆشێكی ئەڵمانی!

لە نەخۆشخانەیەكی ئەڵمانیاو لە تەنیشت ئەو ژوورەی سەرۆكی پێشووی میسر؛ حوسنی موبارەكی تێدا چارەسەر دەكرا، نەخۆشێكی بە ڕەگەز ئەڵمانی هەبوو، ئەو نەخۆشە سەرنجی دا، ڕێوشوێنی ئەمنی توندوٚڵ گیراوەتە بەر، كاتێك زانی، ئەوەی لە ژوورەكەی تەنیشتیدا چارەسەر دەكرێت، سەرۆكی میسرە، لە داروودەستەكەی پرسی: ئەم كابرایە، چەند ساڵە حوكمی میسر دەكات؟ گوتیان: بیستو پێنج ساڵە.

نەخۆشە ئەڵمانییەكە گوتی: بێگومان ئەم سەرۆكەتان، گەندەڵێكی كەم وێنەیە. چونكە ئەگەر كەسێك، ئەو هەموو ساڵە، فەرمانڕەوایی وڵاتێكی كردبێتو بۆ كاتی نەخۆشكەوتنی خۆی، نەخۆشخانەیەكی دروست نەكردبێت، گومانی تێدا نییە، كە گەندەڵە.. سەرباری گەندەڵبوونیشی، تاكڕەوو خۆسەپێنو دیكتاتۆرە، چونكە متمانەی بە پزیشكەكانی وڵاتەكەی خۆی نییە، چارەی دەردەكەی بكەنو دەترسێت دەرمانخواردی بكەن.

* وەزیرێكی سەردەمی عەباسییەكان، بەلای شێتێكدا تێپەڕی، كە سیمای ژیری پێوە دیاربوو.

شێتەكە هەر كە جەنابی وەزیری بینی پرسیاری لێكردو گوتی: جەنابی وەزیر كەسی نووستوو كەی تامو چێژی نیعمەتی خەو دەكات؟

وەزیر وتی: ئەو كاتەی لە خەو هەڵسا.

شێت: باشە چۆن تامو چێژی خەو دەكات، لە كاتێدا لە خەو هەڵساوەو خەوی جێهێشتووە؟

وەزیر وتی: كەواتە: پێش نووستن چێژی خەو دەكات!

شێت: مرۆڤ هێشتا نەنووستووە، چۆن چێژی لێ دەبینێت؟

وەزیر: كەواتە: لە كاتێكدا كە نووستووە چێژی لێ دەبینێت!

شێت: چۆن لە كاتی نووستندا چێژ لە خەو دەبینێت، لە كاتێكدا مرۆڤ لە خەودا، هەست بە هیچ شتێك ناكات!

وەزیر بە وەڵامو پرسیارەكانی زۆر سەرسام بوو، كاتێك نەیتوانی وەڵامی گونجاو بداتەوە، ناچار ملی ڕێگەی گرتو ڕۆیشت.

* دار گوتی بە بزمار: قڵشت تێكردم! بزماریش هاتە وەڵام: گەر ئەو چەكوشەی سەر سەرت دیبام.. لێت نەدەگرتم.

دووبارە ڕووی كردە تەورو پێی گوت: قڕت تێكردین، هەمووانت بڕییەوە!!

تەور گوتی: ئەگەر كلكەكەم لە خۆتان نەبووایە، ئەو كارەم پێ نەدەكرا!

* هەژارێك بە دەوڵەمەندێكی گوت: ئەگەر من، لە ماڵەكەی تۆدا بمرم، چیم لێ دەكەیت؟ دەوڵەمەندەكە گوتی: كفنت لەبەر دەكەمو ئەسپەردەی خاكبت دەكەم. هەژارەكە گوتی: دەی ئەمڕۆ هەتا زیندووم، كراسێكم لەبەر بكە، وەختێكیش مردم، بەبێ كفن ئەسپەردەم بكە!

* كەسێكی ڕەزاقورس بە بەشاری كوڕی بەردی گوت: خودای گەورە بینایی چاوەكانی لە هەر كەس وەرگرتبێتەوە بە نیعمەتێكی گەورەتر قەرەبووی كردووەتەوە، ئەی تۆی بە چی قەرەبوو كردووەتەوە؟

بەشار وتی: بەوەی كە تۆو هاووێنەی تۆ نابینم!!

چرایەک

# باشترین جۆری ڕێجیم، وازهێنانە لە خواردنی گۆشتی مرۆڤ!




- ژیان قەیرانە، جا ئەمە چی تێدایە؟! «مالکۆم برادبری» نووسەر

- هەموو کێشەیەک چارەسەرێکی، ئاسانو جوانو هەڵەی هەیە! «بنیامین» ڕۆژنامەنووس

- دەزانم، کە خودا، هەرگیز شتێک لەسەر ڕێگاکەم دانانێ، کە نەتوانم مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. «دایە تریزا» خێرخواز

- گەورەترین مەتەڵ، لە ژیانی مرۆڤدا ئەوەیە، کە خەمی کۆنە، هێدی هێدی دەڕواو شادییەکی هێمنو ناسک جێگای دەگرێتەوە. «دیستۆفسکی» نووسەر

- ژیان سەختە، پێویستە هەوڵو خەباتت بەگەڕ بخەیت، تا سەرکەوتوو بیت. «مایا ئەنجلو» نووسەر

- ژیان گرنتی نییە، سەرەتا شیرینییەکەت بخۆ! «ئێرنستین ئۆتەر» نووسەر

شناویا محمد احمد

# سەرەڕای بوونی باران، لە کۆڵانەکەی ئێمەدا، چی دەگوزەرێت؟!

ئێوارەیەکی زستانە، دڵۆپەکانی باران، نم نم دەکەونە سەر زەوی، کۆڵانەکەمان بۆنی میهرەبانیی بارانی لێدێت، گەڵا تەڕو ڕوونەکانی دارە هەمیشەسەوزو بەرزەکانیش، بە هێمنی دەشنێنەوە، کوڕە بچکۆلەکەش، تەپ تەپە بە تۆپەکەی دەکاتو هەر لەو کاتەدا، دایکی بانگی دەکاتو ملپێچێك دەخاتە ملی، دەڵێ: کوڕم با سەرمات نەبێت، باپیرەش لەولاوە، خەریکی لێکردنەوەی بڕە زیادەکانی نەمامەکەیەتی، هەندێك لاوی سەر لێشێواویش، لە سووچی کۆڵانەکەدا وەستاون، کە خۆیان لە خوێندنگە هەڵهاتوونو گیرفانیشیان بەتاڵە، جگە لە چەرخێكو پاکەتێك جگەرەو هەزارو پێنج سەد دینار، هیچی دیکەی تێدا نییە.. کارەساتەکە ئەوە نییە، کارەساتەکە ئەوەیە؛ گیرفانیان زۆر پڕترە لە مێشکیان! چاوەڕێی زەنگی کۆتایی خوێندنگەیەکی کچان دەکەن، بەو هیوایەی ئەمڕۆ، ڕۆژی بەختی ئەوان بێتو کچێك بکەنە نێچیری خۆیان، ئەمانە زۆربەی کات، بەخت یاوەریان دەبێتو نێچیرەکەیان دەگرن! بەڵام چ بەختێك (بەختێکی ڕەش).. کیژۆڵەی ساویلکە بێئەوەی تۆزقاڵێك مێشکی بەکاربهێنێت، خۆی دەکاتە نێچیرو وا دەزانێت ئیتر لە دنیای خەیاڵو ڕۆمانسیەتدا دەژی!! داپیرەی میهرەبانیش گوێی لە بانگی ئێوارە دەبێتو لەسەر بەرماڵ بە دڵ داوای نووری هیدایەت دەکات بۆ ڕۆڵەو نەوەکانیو داوا لە پەروەردگار دەکات؛خێرو خۆشیو بەختەوەری بڕژێنێتە ناو ماڵەکانیانەوە.

چایخانەیەکیش هەیە لە کۆڵانەکەماندا، کە بەردەوام جمەی دێت؛ لە خەڵکی جۆراوجۆرو مێزەکانی بەر دەرگاکەشی بەردەوام پڕن لەو خەڵکانەی خۆیان بە ژمارە یەك دەزانن! ئەو کەڵە پیاوانەی بڕیارە گەورەکانی ژیانیان لەگەڵ دەستەیەك دۆمینەو دەستەیەك کۆنکەنو پیاڵەیەك چادا، دەبێتە بڕیاری کۆتایی! قاقای پێکەنینەکانیشیان، لە کاتی بردنەوەدا بە جۆرێکە، کە منداڵە ساواکەی خانووەکەی تەنیشتیان بەخەبەر دەهێنێتو دەیخاتە گریان، شەڕو پێکدادانەکانی کاتی دۆڕانیش، وا دەکات هەموو منداڵانو لاوانی کۆڵان کۆ بکاتەوەو دواتریش دەبێت بە واتەواتو هەر یەکە چیرۆکێك درووست دەکات، بۆ هۆکاری شەڕەکە.

کاتێکیش گەڕایەوە ماڵەوە، دەیکاتە بەزمو هەرا، ڕووخسارێکی گرژو قسەکردنێکی وەك بەرد، چونکە بە دڵی خۆی، هاوسەرگیری نەکردووەو هاوسەرەکەی بە دڵی ئەم نییەو ئەم جۆری جیاوازتری دەوێت، منداڵەکانیشی بە ئەم چی، خۆ بە هۆی منداڵەکانییەوە، نابێت بە پاشا! چی دەکەنو بۆ کوێ دەچن بە جەهەننەم، خێرا تیکە نانێکی پێ بدەنو با بڕوات کەمێك پشوو بدات، ئاخر ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووە!! ئەم جۆرە کەسانە چ براوە بن، یان دۆڕاو چ دەوڵەمەند بن، یان هەژار، هەر یەك وێنەیان هەیە لە ماڵەوە! هەموو دنیا هی ئەمان بێت هاوسەرەکەیو منداڵەکانی چاویان لە دەستی خەڵك دەبێتو چاوەڕوانی سۆزو میهرەبانی ئەمو ئەون، سەیریش نییە ئەگەر خەڵك ئەمە چەواشە بکاتو وەك یاری، یاری بە ماڵو منداڵیان بکات، زۆربەی کاتیش هەر ئەمە دەرەنجامەکەی دەبێت.

لە سێ منداڵدا، یەکێکیان بە باشی دەخوێنێت، ئەویش تاکە کەسە لە خێزانەکەدا، کە بیربکاتەوەو بە هیوایە لەم دۆزەخەدا، بێتە دەرەوەو بەرەو کۆڵانێکی تری ژیان بەڕێ بکەوێتو جێگیر بێت، ئەمیان خەونی هەیەو ڕووناکی دەبینێت، دەشزانێت چۆن بۆی دەچێت.. کوڕە لاوەکەی، تاقەتی خوێندنی نەماوەو وانەکان گرانەو چارەی مامۆستاو خوێندنگەکەشیانی ناوێت، ئەو یەکێکە لە پاڵەوانەکانی ئەو پێڕە فاشیلەی کە لەسەر جادەکان، خەریکی ڕاوکردنی کچانن، بێگومان هەروا دەبێت، کەسێك لەسەر جادە بەدوای خۆشەویستیدا بگەڕێ، هەر کەسێکی سەر جادەی دەست دەکەوێتو هەر لەسەر لێواری جادەکانیش، خۆشەویستییەکەیان فڕێ دەدەنو دەکەونە بەر پێی خەڵکی! کچەکەی تریش، تەمەنی گەورە بووەو بێزار بووە لە قسە ڕەقو ناخۆشەکانی باوکیو بێدەنگییەکانی دایکی، لە ئاست هەموو شتێکدا، بۆشاییەکی زۆر زۆری هەیە لە ماڵەوە؛ ناز، پارە، خۆشەویستی، بایەخپێدان، ڕێنمایی تەندرووست.. هیچ کام لەمانەی دەستناکەوێت، بۆیە بیر لە هاوسەرگیری دەکاتەوە، دەستی کردووە بە ژیانێکی خۆپەرستانەو بەردەوام خەریکی مۆبایلەکەیەتی؛ بۆ دۆزینەوەی کەسێك، کە بۆشاییەکانی بۆ پڕ بکاتەوە، جارێ شتی لە پێشتر هەیە، کە ئەم پێویستییەتی؛ وەك لە خوێندن، خوێندن چییە، هەر کات بیەوێت، دەتوانێت بخوێنێت؛ چونکە دڵنیایە شاسواری خەونەکانی، ڕێگەی هیچ شتێکی لێناگرێت!!

ئاه.. چ لادانێك بەدی دەکەم، لەم کۆڵانە تەسکانەدا!! چ ژیانێکی تاریك دەبینم، لەم کۆڵانە تەسکانەدا!! تۆ بڵێی ئەمە هەتا چ سەردەمێك درێژە بکێشێت؟! هەر کاتێکیش باسی هۆکاری ئەم شتانە بکەیت، (پارە) دەبێتە یەکەم وەڵام، کاتێکیش باسی چارەسەر بکەیت، دیسان هەر پارە دەبێتە یەکەم وەڵام! باشە.. با وێنەی ئەوەش بهێنینە بەر چاومان، کە ئەمانە پارەیان هەبێت، ئاغای ژمارە یەك! یەکەم شت بیر لە هێنانی ژنی دووەم دەکاتەوە! پارەی هەیە، ماڵی هەیە، کەس بۆی نییە؛ پێی بڵێ چی بکەو چی مەکە، ئەو خۆی پیاوەو هەموو شتێك بە باشی دەزانێت! دواتر هەر بەردەوام دەبێت لەسەر یاریکردنو وردە وردە هەموو شتێك دەدۆڕێنێت، هەرچەندە پێشتریش، هەر هەموو شتێکی دۆڕاندووە، بەڵام هەستی بەخۆی نەکردووە، چونکە مێشکی هەندێك کەس لە چاویاندایە، تەنها شتە بەرجەستەییەکان دەبینن، هەستی پێدەکەن، شتە دەروونییەکان نابینن.. ئەو لاوەش ئێستا ئەگەر لەسەر سووچی کۆڵانەکان بووەستێت، بۆ کچی قۆناغی دواناوەندی، ئێستا پارەی لەبەردەستایەو سەیارەی مۆدێل بەرزو لە جیاتی مۆبایلێك دووانو سیانی پێیەو بە ئارەزووی خۆی کام کچەی بوێت، لە زانکۆو دەوامو خۆشترین شوێنەکانی یەکێکی تر لە کۆڵانە وێرانەکانی ئەم کۆڵانەدا دەدۆزێتەوەو درێژە بە ئەو ژیانە دەدات، کە خۆشی نازانێت؛ چۆن دەستی پێکردووەو چۆن کۆتایی پێدەهێنێت، هەتا ڕۆژێك، تووشی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی قورس دەبێتو بە ملیۆنان دیناریش ناتوانێت ڕزگاری بکات! خاتوونیش، کە بۆشایی هەبوو، ئێستا بە هێزی پارە، هەندێك لە بۆشاییەکانی نەماوە! بەڵام هیچ هێزێکی دنیا، ناتوانێت ئەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوە، کە لە دەروونی مرۆڤەکاندا دروست دەبێت، تەنانەت پارەش! بۆیە بەردەوام لە گۆشەگیریو بێزاریدا دەژیو تەنانەت پاش هاوسەرگیریش، هەست بە بۆشایی دەکاتو ناتوانێت؛ نە بەردەوامی بە خوێندنەکەی بدات، نە بەو شێوەیەش دڵخۆش بێت، کە خۆی دەیویست.. ئەو منداڵەش، کە خەریکی شتی لاوەکی نەبوو، کاریگەری ئەو ژینگە ناخۆشەی لەسەر نەبوو، هەر بەردەوام بوو لەسەر ڕێچکە تەندرووستییەکەی ژیانی خۆیو کەسێکی بەختەوەرو سەرکەوتووی لێدەرچوو، تەنانەت لە تاریکیشدا، دەتوانێت ڕووناك بێت.. ئەوە، دەکەوێتە سەر هێزو ژیریو توانای خۆی.

هۆکاری هیچ کام لە شکستەکانی ئەم مرۆڤانە، پارە نەبووە، هەر لەم کۆڵانەشدا، کەسانێك هەن؛ کە بە باشترینو جوانترین شێوە ژیانیان ڕێکخستووەو باوکیان بە میهرەبانیو ژیری خۆیەوە، کۆنترۆڵی خۆیو خێزانو ژیانی دەکاتو هەمووان بە گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە دڵخۆش دەبنو خانمی ناوماڵیش، دەبێتە ڕەوێنەری هیلاکییەکانیو هاوبەشی خەمەکانیو هۆکاری پێشکەوتنی لە ژیاندا.. منداڵەکانیشی، لەبیری ئەوەدان؛ چۆن ڕێگاکەی باوکو دایکیان تەواو بکەنو ببنە هۆکارێك بۆ دڵخۆشی ئەوانو هەروەك چۆن ئەوان لە ژێر سایەی دایکو باوکیاندا، بوونەتە مرۆڤێکی کامڵو سەرکەوتوو، ئەوانیش ببنە سایەی دایکو باوکیان لە کاتی پیریداو تەواوکەری یەکتربن، بە ڕێگایەکی درووستدا دەڕۆنو لە کارەکانیاندا سەرکەوتوو دەبنو هاوسەرێکی گونجاوو ژیر هەڵدەبژێرنو هەموویان ئێوارە، لەسەر مێزی نانخواردن کۆدەبنەوەو بە پێکەنینو قسەی خۆشەوە، شەوەکانیان بەڕێ دەکەن، نەك لەسەر مێزێکی بچووکی قومار!!

هەمووی ئەمانە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕووناکییەی، کە دەکەوێتە سەر دڵی مرۆڤەکان، وەرگرتنی ئەو نوورەی، کە لە ڕێگەی دڵۆپەکانی باران؛ ئەو بارانە نا، کە دەبارێت بە سەرماندا، ئەو بارانەی، کە دەبارێت بەسەر دڵو ڕۆحماندا، ئاسوودەیی ڕاستەقینە، کاتێك دەست پێدەکات، کە دڵۆپەکانی باران بگاتە ناخی مرۆڤ.. هەر ئەو ڕووناکییەی بەهۆی بەرزکردنەوەی دەستەکانمان بۆ ئاسمان دەستمان دەکەوێت، ئەو ڕووناکییەی بە هۆی ویژدانی خۆمانەوە دەستمان دەکەوێت، یان ئەو ڕووناکییەی بە هۆی ژیرییەوە دەستمان دەکەوێت، بەڕاستی ویژدانو ژیری، گەورەترین بەخشراوی پەروەردگارە بۆ ئێمە، ویژدان وات لێدەکات، کە هەرگیز زاتی ئەوە نەکەیت، شتێکی خراپ بکەیت، چونکە بەردەوام ئازارت دەدات؛ بە کردنی شتی خراپ، ژیریش وات لێدەکات لە نێوان دوو ڕێگەی باشو خراپدا، تۆ سێیەم درووست بکەیت، کە (باشترینە)!

# فێری تۆڵەکردنەوە ببە!



و: چیمەن لەتیف

ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان، لە یەکێك لە جەنگەکانی ژیاندا، شکستت هێنا، پێویستە تۆڵە بسێنیت.

مەبەستت بوو، ئامانجێکت بەدیبهێنیت، ئەگەر کەسێك پێشت کەوت، ئامۆژگاریت دەکەم حەقی خۆت وەرگرە. ئەگەر تووشی ئاستەنگێك بوویت، یان داوای شتێکت کردو بەدەستەوە نەهات، یاخود تووشی شکستێك هاتیت، دەستوپلت ڕابهێنە؛ بۆئەوەی تۆڵە بکەیتەوە.

کاتێك نەیارەکانت، تاڵاوی ناخۆشیو حەسرەت، بەگەرووتدا دەکەن، ڕاستبەرەوە، کاربکە، بەڕاستگۆیی تێبکۆشە، هەرگیز شکستەکانت بیرنەکەیت، وەك نووکی دەرزی گیانتی پێ دەرزیئاژن بکە، بۆئەوەی هەڵبچیت، تاتۆڵە بکەیتەوە.

ژیان جەنگە، زۆر کات شەڕ وێرانکەرە، خۆت ئامادە نەکردووە، لەناکاو لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا، خۆت دەبینیەوە، گەشبین بە، تێبکۆشە لەپێناو بەهایەك، بنەمایەك، ئامانجێك، خۆزگەیەكو ئاواتێکدا.

لەوانەیە بدۆڕێیت، بەشێوازە چەپەڵو ستەمکارانەکەی یەکێك لە جەنگەکانی ژیاندا، تێکت بشکێنێت، ئەو کات دەبێت چی بکەیت؟

لێرەدا خودا لێخۆشبوو مامۆستای پایەبەرز (عەبدولوەهاب مطاوع)، وەڵامت دەداتەوە:

(بەرانبەر ئەوانەی خراپەیان لەحەق کردوویت، باشترین هۆکار بۆ تۆڵەسەندنەوە ئەوەیە: وەك ئەوان نەبیت، هەوڵ بدە لە ژیاندا هەمان ڕەفتاری نەخۆشی ئەوان نەگریتە بەر، وەڵامیان مەدەرەوە، تا زیاتر هەست بە ڕیسوایو بێبایەخی خۆیانو کردەوەکانیان بکەن).

ئەوە ئەو جۆرە تۆڵەسەندنەوەیە، کە من دەمەوێت، نەك تولەی نەرێنی، کە وەك ئاور، کڵپە لە دڵت بەر بداتو بەشاڵاوی ڕۆحت بخوات.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَىٰ وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ ﴾ المدثر: ٥٦، لەگەڵ ئەوەی دوو شتی پێچەوانەن، چاوپۆشیو لێبوردن دووشتی زۆر گرنگن، جۆرێکی بەرزی تۆڵەکردنەوەیە، کە پیاوچاکانو چاکەخوازان لە ژیاندا هۆگری بوون. وشەی تۆڵەسەندنەوە، لەوانەیە کەمێك بێزارت بکات، بەڵام منی "نووسەر" ڕووە باشەکەیم هەڵبژارد، کڵپەی تولەسەندنەوە گەرمو بەتینە، چونکە وا دەکات ڕقت لە شکست بێتەوە، بێز لە سەرنەکەوتن بکەیتەوە، هۆکارەکان بەزەبرن، بۆئەوەی چاکسازی لە شتە خراپەکاندا بکەیت.

## چۆن تۆڵە بکەینەوە!؟

وینستۆن چەرچڵ "سەرەکشالیاری بەریتانیا، لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، دەڵێت: "هەر یەکێکمان ڕۆژێکی هەیە، بەڵام ڕۆژەکان، هەندێکیان لەوانی تر درێژترن، چونکە ڕۆژانی ستەمکاری درێژە، بەهەمان شێوە ڕۆژانی سەرکەوتنیش، کاتێك بەئاگا دێینەوەو دەمانەوێت ئازاری شکستەکان لەبیر بکەین، بەڵام هێشتا کاتێکی زۆر ماوە، بۆ ئەو کارانەی دەمانەوێت جێبەجێی بکەین، بیرکردنەوەی لەسەرخۆ، پەلەنەکردن، هەڵنەچوونو دەمارگیری، باشترین هەڵبژاردەن لە ژیاندا، بۆئەوەی تۆڵەیان پێ بکەیتەوە.

ئێستا ماوەم بدە، ئەو جۆرە لە تۆڵەکردنەوەیەت پێ بڵێم، کە لەتۆم دەوێت:

# ڕازێك له نێوان منو دۆڕاندا!

بەڵێن ئەنوەر

وەرە ئـەی هاوتەریبی دەواری ڕۆحی ماندووم، وەرە ئەی موتریبی میهری موورادی دڵی برینداروم، وەرە کاسەکەت بێنە، با جامێك خوێنت بدەمـێ! من دەمێکـە خەونو خەیاڵ نوقمی کـردووم، بیری بردووم، شـەوو ڕۆژی لێ ونکردووم. بۆیە ئێستا مەستی مەستم، بەڵام بێهۆشو غافـڵ نیـم، تەنها خۆرم لێ ئـاوا بووە! کێ هەیە؛ وەك من وەسـفی مەرگـو ژیان بکات؟! کێ وەك من؛ تاریکییەکان دەناسێو جاری مەرگی شەوەزەنگی تاریكو لێڵ دەدرکێنێ؟!

ئەمێستاکە، ژیان وەکو کوخێك دێتە بەر چاوم، کە نە من ئارەزووی دەکەم، نە ئەویش وەکو جاران، لەناو خۆیدا هەڵم دەگرێو دامدەپۆشێ. ئێسـتاکە، لەبەرچاوم ڕەنگی پـەڕی باڵندەکانی ئاسـمان کاڵ بۆتەوە، ڕوخسـاری گوڵەکان گرژن! بولبولەکان لـە نۆتەو ئاواز کەوتوونو لە بێنەواییدا، نەوای دەنگیان نووساوە. ئای چ مەحشەرێکە ئەمڕۆ! ئای چ ئاگرێك بەر بۆتە هەگبـەی ئارەزووەکانم! ئازاری زەبوونی مرۆڤەکان، ڕۆحـی ماندووم، شـەکەتو ماندووتر دەکەن، ڕازە دروێنەکان، گشت ئارەزووە پاکەکان دەبەزێننو وەکو نەشتەرێکی بزێو، دیواری هیجرانم کـون دەکەنو بـە ناخمدا ڕۆدەچن، هیچ تروسـکاییەك ناهێڵنەوە، کە ئارامییەك بە دەروونو پشـوویەك بە جەسـتەم بدات. ئێستا دەزانم؛ کات چەنـدە کاریگەرە! کاتەکان هێندەی کابوسـێك، قورسـن لەسـەر منـی مرۆڤ، وەکو ماڵو سـامانن، هەرچەند دوایـان بکەوی، خێراتر دەڕۆن، نــە وێنەیەك، نە دەنگێك، نە ڕەنگێك، هیچ ئاسـەوارێکیان لێ بـەدی ناکرێ، جگە لـە یەك مانا نەبێ، کە مـن لەوەتەی لەم مانایە تێگەیشتووم، ئازار دەچێژمو دەتلێمەوە!

لە ئێسـتادا، جگە لە بەسـەرچوونی کاتو خولیاکانی ژیانم، هیچ شتێکی تر شك نابەم، کە بە گرنگییەوە باسی بکەم، حەسرەتو نامۆییم بـەوەی، کە ناتوانم ئـەوە بم، کە خۆم دەمـەوێ، ناتوانم ئەوە بکەم، کـە بە ڕۆح، ئـارەزووی دەکەم، ناتوانم وێنەیەك، یان شـێوەیەك، یان ڕەنگێك بە کاتەکانی ژیانم بدەم، تەواو شەکەتو بێئۆقرەیان کردووم. بـەڵام هاورێ: "بێئۆقرەییم، مانای دۆڕان نییە"، من مووددەتێکی زۆرە، لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا دەژیم، بەڵام وا نازانـم، کە دۆڕا بـم، تەنها هاوسـەنگیی خۆم لێ گۆڕابوو. من ئێسـتا تێگەیشـتووم، کە بە دونیا نــە دۆڕاوم، بەڵکـو ئەوە دونیایـە، کە بە مـن دۆڕاوە، ئەوەی کە من دەمویست، دونیا پێی نەبەخشـیوم، دونیا جێگای تێرکردنی ئارەزووە ڕۆحییەکانی من نییە، ئەو شـتەی کە من بـە دوایدا دەگەڕێم، نرخو بەهای خۆی هەیە، ئەوەتا لە مێشکو بیری خۆمدا، لە ویژدانی خۆمدا هەڵم گرتووە.. نەك ئەوەی، کە لە دونیادا، چاوەڕێم دەکردا!!

* ئەگەر ژیانی سـۆزداریت، تووشـی شـڵەژان بوو، پێویستە بـە تۆڵە دەسـت پێبکەیـت، بەشـێوەیەك دەربکەویت؛ زیاد لە چاوەڕوانیـی هەمووان! کاتێـك دیاری بکەو بەخۆتـدا بچۆرەوە، لایەنە خراپەکانی ژیانی سـۆزداریت، بەشـێوەیەکی تەواو، شیکار بکـە، مەبە بە کۆیلەی ئەو بارودۆخە، زۆر بخۆێنەرەوە، ڕاوێژ بە کەسـانی باش بکە، بەشـداربە لە خولێك، یـان وانەیەك لەبارەی پەیوەندیی خێزانییەوە، هەرگیز ڕازی مەبە لەو هاوسـەرە کەمتر بەختەوەربێت، کە چێژ لە ژیانی وەردەگرێت.

* ئەگەر هاوکارێك، یان هاوپیشەیەکت فەرامۆشی کردیت، یان دڵـرەق بوو بەرامبەرت، یان هاورێیەکـت ناپاکی لەگەڵدا کردیت، یاخـود یەکێکیان، خراپەی لەهەقدا کردیت، تۆڵە بسـێنە! هەوڵ بـدە بەرانبەریـان، کەسـێکی زۆر بەڕێزو بەئاکار بیت، هەسـتە خراپەکانـت بەرامبەریان بخـۆرەوە، دەریان مەبـڕە، چاوەڕوانی پاداشتی خودای میهرەبان بە.

* ئەگەر پرۆژە تایبەتییەکەت، دووچاری ئاستەنگ بوو، یان لە گرێبەسـتێکی بازرگانیدا، هەموو سـەرمایەکەت دانا، هەمووان پێشـبینی ئەوەیان دەکرد، هەسـتانەوەت کارێکی مەحاڵە، داوا لە خودا بکە؛ لەسـەر ئەو کارەساتە خۆڕاگربیت، تۆڵە لەو بارودۆخە بکـەرەوە، جارێکی تر تۆپەکە بخەرە گۆڕەپانی بەرامبەرەکەتەوە، بەشێوەیەکی وردتر، پلانەکانت دابڕێژە، هەمووان ئاگادار بکەرەوە، ئەوا پێت بەسـەر ئاوزەنگی ئەسـپەکەت ناوەو واهاتییەوە، بەڵام ئەمجارەیان، بەتواناوە دەگەڕێیتەوە.

* ئەگەر لە کارەکەتدا، بەڕێوبەرەکەت، مامۆسـتای زانکۆکەت، کەسێکی کەللەرەق بوو، هەوڵ بدە لەسەرووی گومانی ئەوانەوە بیت، بەشـێوەیەك دەربکەوە، کە گشـت بۆچوونەکانی ئەوانە وردوخاش بکات، کە دەیانەوێت بە تەممەڵ، یان شکستخواردوو ناوت بهێنن.

* ئەگەر ئەهریمەنی ناخت، بەسـەرتدا زاڵبوو؛ بەرامبەر بە کەسـێك هەڵەیەکی پێکردی، یان باسـی برایەکت بە خراپە کرد، یاخـود یەکێکیانت بە وتەیەك، کردەوەیەك ئازاردا، لە شـەیتانی ناخت، بە شمشـێری پـۆزش تۆڵە بکەرەوە، بـە زیندوکردنەوەی ویـژدانو جوانکردنـی ڕەفتارت، لاوازی بکە، داوای لێخۆشـبوونو لێبوردەیی لەو کەسانە بکە، کە بەرامبەریان خراپەت کردووە.

* ئەگـەر ئارەزووی دەروون، بە کۆیلـەی کردیت، بێئاگاییت درێـژەی کێشـا، بە تۆبەکـردن بگەڕێرەوە بۆ بازنـەی باوەڕ، بە تۆبەکـردن خـۆت ئامادە بکە، بـەداوای لێخۆشـبوونو گەڕانەوە بـۆ لای خودای میهرەبان، دەسـت بەسـەر لاوازییەکانی دەروونو ئارەزووەکانتدا بگرە.

هاورێ لە ژیاندا، بەم شێوەیە ڕاڤەی ڕووداوەکان بکە....

فێربـە پێـت هەڵنەکەوێـت، بەدەمدا نەکەوێـت، هەوڵ بدە پەرچەکـردارت تونـدو یەکلاکـەرەوە نەبێـت، تـا سـەرلەنوێ هاوسەنگیت بەدەست بهێنیتەوە.

**پوختە: تۆڵەکردنەوە دوو ڕووی هەیە: ڕووە ڕەشەکەی ویژدانو ڕۆحت دەخوات، هاندەرە؛ بۆئەوەی کەسـانی تر ئازاربدەیت، ڕووە سپییە پرشـنگدارەکەی، ڕۆحت گەشاوە دەکات، تا ڕەفتارو ئاکارت بەهێزترو جوانتر دەربکەویت.**

# خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە!!

ن: د. حذیفە العمقی
و: فێنك جەماڵ

* لەگەڵ کۆمەڵی بێبەرنامەدا مەبە....

بە گشتی زۆر دەخەون، زۆر دەخۆن، زۆر پێدەکەنن، قسەو گاڵتەو غەیبەت زۆر دەکەن، دوا دەکەونو پێش ناکەون، خەڵکی کاری تێ دەکات، بەڵام خۆی کار لە کەس ناکات.

هەرگیز لە کاتی تەنگانەو ناخۆشیدا نایاندۆزیتەوە مەبەست لەو کۆمەڵەی مردوون.

بەردەوام سەرقاڵن بە باسی فلانو فیسار، کێ هات؟ کێ ڕۆیشت؟

ئەگەر ڕۆژێك لێی بپرسیت: ئامانجت چییە لەم ژیانەدا؟؟

چەند شتێکی ئاساییت پێ دەڵێت، کە ئامانجی ئەوەیە هاوسەرگیری بکاتو ببێتە خاوەنی منداڵو موچەیەکی هەبێت، بۆ داهاتوی!! فەرمودەی پەیامبەرمانی لەیاد کردووە، کە ئاگادارمان دەکاتەوە لە هاوەڵێتیی کۆمەڵی بێبەرنامەی وەکو مێگەلداو دەفەرموویێت: کوێر مەبن، بڵێن ئەگەر خەڵکی چاکیان کرد، ئێمەش چاك دەکەین، ئەگەر خراپەیان کرد، خراپە دەکەین، بەڵکو خۆتان دڵنیا بکەنو گەر خەڵکی چاکەیان کرد، چاکە بکەن، گەر خراپەیان کرد، ئێوە خراپە مەکەن!

گاندی دەڵێت: کاتێك ئامانجێکی گەورە، یان بیرۆکەیەکی ناوازەت دەبێت، ئەو کۆمەڵەیە، بەم جۆرە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن، سەرەتا پێت پێدەکەنن، بە نەزانت دادەنێن، دوژمنایەتیت دەکەن، گفتوگۆت لەگەڵدا دەکەن، تا پەشیمان بیتەوە، بەڵام کاتێك سەرکەوتنت بە دەستهێنا، ئەو کات دان بە تواناکانتدا دەنێن..

زیاتر لە ٨٠٪ی خەڵکی دنیا، بێجگە لە پرۆگرامی خوێندن، شتی دیکە ناخوێننەوە.

نزیکەی ٩٥٪ی خەڵکی، دوای تەواوکردنی زانکۆ ناخوێنێتەوە.

لە ٩٧٪ی خەڵکی بەرنامەیان، بۆ ژیانیان نییە!

زیاتر لە ٩٠٪ی خەڵکی جیهان، لە قسەکردن لە بەرامبەر خەڵکیدا دەترسن.

* لەگەڵ کۆمەڵدا مەبەو بەرگری لە خەونەکانت بکە.

هێلین کیلەر؛ ئەو ئافرەتەی، کە نابیناو نابیست بوو، توانی خوێندنی زانکۆ تەواو بکاتو دکتۆرا لە زانستو دکتۆرا لە فەلسەفەدا بەدەست بهێنێت، یەکێك لە جوانترین وتەکانیشی؛ سەرت دامەخە بۆ کێشەکانت، بەڵکو سەربەرزبە، ئەو کاتە لە بەردەمتدا، جیهان بەرێکی دەبینی!

ئەو مرۆڤە بە نابینایی ڕووناکی هیوای دەبینی، ئەی ئێمە چی بەخۆمان بڵێین، کە دەبینین؟!!

ئەنیشتاین؛ کەسوکارەکەی پێیان وابوو، کە دواکەوتووە، چونکە تەمەنی ١٠ساڵی تێپەڕاندبوو، هێشتا فێری قسەکردن نەببوو، بۆیە مامۆستاکانی پێیان دەوت، شکستخواردوو!

شکستخواردوویو گاڵتەپێکردنو هەژاری کاری تێنەکرد، بەڵکو بووە خاوەنی گەورەترین تیۆری فیزیایی!!

لەبەرئەوە دەڵێم: ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵدا بێت، لەوە دوورتر ناڕوات، کە ئەوان پێی گەیشتوون، هەر خۆت بە، لە کۆتاییدا خۆت دەبینیتەوە لە شوێنێکدا، کە کەس پێی نەگەیشتووە.

* خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە!!

خۆزگە گەلەکەم بیانزانیایە، کە من لە دێر زەمانەوە... ئەم ڕێگایە دەبڕم، ڕێگای سەربەرزیو سەرکەوتن، ئەوەی کە خۆم هەڵبژاردووە، بە پێنووسەکەی خۆم وێنام کێشاوە، لە دڵمدا جێگیرم کردووە، وام لێکردووە هەموو چرکەیەك بە دەمارو خوێنمدا بڕوات، لەگەڵ هەموو بەیانییەکی نوێو ڕۆژهەڵهاتنێکدا هەست دەکەم نزیك دەبمەوە لە ئاواتەکانم.

کاتێك مرۆڤ، دەگاتە خۆشەویستیی ڕاستەقینە بۆ خودا، باوەڕی تەواو بە خەونەکانی هەیە، هەوڵی بەردەوام بەرەو ئاواتەکانی دەدات، هیچ شتێك نییە لەبەردەمیدا مابێتەوە، جگە لە کات، ئەویش بە تێپەڕبوونی کات نزیکتر دەبێتەوەو وردە وردە ناوەکەی بە خەونەکەیەوە دەنووسێت، هەر بەربەستێك لەبەردەمیدا دەبێتە ئەزموون، هەروەها دەبێتە تاقیکردنەوە، تا چەند ئارام دەگرێ لە پێناو ئەوەی دەیەوێت.

ئێستا کاتی ئەوەیە؛ دەست بە گەشتەکەت بکەیت، کە خۆت شۆفێریتو چەندان کەسیش، لە پاش تۆ سوودی لێ دەبینن.

ژیان هەلەو ناگەڕێتەوە، بیسەلمێنە بۆ هەموو جیهان، کە تۆ زۆر لەوە گەورەتریت، کە بیریان لێ دەکردیتەوە، تەنانەت لەوەش، کە خۆت بیرت لێ دەکردەوە.



چیا عەبدوڵا

# بنەماکانی بەختەوەری

## بەشی یەکەم

**بنەمای یەکەم: ئارامیی دەروونی لەناخەوە:**

کاتێـک کیانـی نـاخو ناوەکیـت ئارامــیو ئاشـتی تێدابوو، پەیوەندیت بەزاتی ڕاستەقینەتەوە هەبوو، دووربوویت لە لایەنە نەرێنـیو کـۆتو بەندەکانـی، هێزی خۆشەویسـتی، ڕۆحو دڵتی پڕکردبـوو، ئەوا کیانی ناوەکیت، بەرگرییەکی بەهێزت پێدەدات؛ لــە بەرامبەر هــەر کاریگەرییەکی دنیای دەرەوە، بەم شـێوەیە؛ شەوان خەوێکی قووڵو ئارامت لێ دەکەوێت.

**بنەمای دووەم: تەندرووستیی باش وزەیە:**

بەداخەوە تەندرووسـتیو وزە، کۆتا شتن، کە ئێمە گرنگییان پێدەدەین، خەڵکانێکی زۆر جگەرە دەکێشن، زۆر دەخۆن، قاوەیەکی زیاد لە پێویست دەخۆنەوە، زۆریش دەگمەنە، کە وەرزشێك ئەنجام بدەن، چ کاتێك نرخی تەندرووسـتیو وزە دەزانیت؟ ئەو کاتەی، کە تووشـی کارەسـاتێك دەبیت؟ ئەو ڕێگایەی، کە عەقڵی لەسەر بەرنامەڕێـژ دەکەیت، ئەو ڕێگایــەی، کە خواردنی پێ دەخۆیتو ئەو شـێوەیەی، کە وەرزشـی لەسـەر دەکەیت، کاریگەری دەبێت لەســەر ئاسـتی وزەت، کاتێك تەندرووسـتییەکی باشت دەبێتو وزەیەکـی بەرزت هەیــە، ئەوا توانات زیاتر دەبێتو هەسـت بە کیانی خۆت دەکەیتو زیاتریش هەست بەبەختەوەری دەکەیت.

**بنەمای سێیەم: خۆشەویستیو پەیوەندییەکان:**

کاتێـك پەیوەندیـت بەدەوروبەرتـەوە باش دەبێـت، کاتێك پەیوەندیـی خۆشەویسـتیت لەگەڵ کەسـان نزیـكو دەوروبەرت بەهێزە، ئەو کات هەسـت دەکەیت، کە ئەوان گرنگیت پێدەدەنو وات لێدەکەن، کە هەست بکەیت ئەوان پێویستییان بە تۆیە، ئەوا زیاتر بەختەوەر دەبیت.

**بنەمای چوارەم: بوونی خود:**

کاتێك ئامانجێکی نرخدارت دەبێتو گەرموگوڕییەکی زۆرت بۆی هەیە، خۆت دەبینی، کە هەوڵی بەدیهێنانی دەدەیت، هەستت بەرامبــەر خودی خۆتو تواناکانت بۆ ســەرکەوتنت زۆر ئەرێنی دەبێـت، ئاواتەکانـت بەدی دەهێنیت، کاتێك ئـاواتو ئامانجێکی تـر دادەنێیـت، متمانەت بەخۆت هەیە، هەسـت دەکەیت، کە تۆ کاریگەرییەکی ئاشکراو ڕوونت هەیە لە ژیانداو زیاتر بەختەوەر دەبیت.

ئەم چـوار بنەمایــە، ســەرچاوەی بەختەوەریو ســۆزداری ئەرێنین، لاوازیت لە یەکێك لەم بنەمایانە، ڕەنگە ببێتە هۆکاری ئازارو ســۆزداری نەرێنی، ئێسـتا بزانین چۆن هەسـتو نەستی نەرێنی، بگۆڕین بۆ هەســتو نەستی ئەرێنی، لەم چرکە ساتەدا، ســێ بنەمای ســەرەکی هەیە، کــە هاوکاریــت دەکات لە گۆڕینی هەستو نەستی نەرێنی:

**بنەماکانی گۆڕینی هەستی نەرێنی بۆ ئەرێنی:**

**بنەمای یەکەم: جووڵەی جەستە:**

ئەو ڕێگایەی کە جەسـتەتی لەسەر دەجووڵێنیت، کاریگەری هەیە لەسەر زیهنو هەستو نەستت.

**ئەم یارییەم لەگەڵدا ئەنجام بدە:** شانەکانت بەرە بۆ خوارەوەو ســەرت داگرە بۆ خوارەوە بەرەو پێش، زۆر بەهێواشــی هەناسە بدەوە بیر لەشتێك بکەرەوە، کە زۆر بێتاقەتت دەکات، لەدوامەوە بیڵێرەوە (من دڵخۆشم)!

ئایـا ئــەم ڕێگایە بەســوودە؟ کاریگــەری هەیــە؟ بێگومان نەخێر، ئێسـتا با پێچەوانەکەی ئەنجام بدەین: شـانەکانت ڕێك بەرزبکەرەوە، ســەرت بەرز بکــەرەوەو بەهێزەوە هەناســە بدە، دەســتەکانت توند بنووقێنە، وەك یاریزانی بۆکسـێن، لەدوامەوە بیڵێــرەوە (من لاوازم)، ئایا ئەم ڕێگایە ســوودی هەیە؟ بێگومان نەخێر، لە هەردوو حاڵەتەکەدا جووڵەی جەســتەت ئەو ئاماژەیە پێچەوانــە ناکاتەوە، کە دەینێریت بۆ زیهنت، کاتێك نەخۆشـێك دێـت بۆ لام و پێم دەڵێت: هەسـت بــە دڵتەنگی دەکەم، زۆر جار لێیان دەپرسم چۆن ئەمە ئەنجام دەدەیت، مەبەستم لەم پرسیارە ئەوەیە، کە ڕەچاوی دووشت بکات:

* ئەو کەسە خۆی هۆکارە لە درووستکردنی ئەو هەستە.
* حاڵەتی دەروونی ڕەنگدانەوەی جووڵەی جەستەیەتی.

پرســیاری لێدەکــەم، کە جووڵەی جەســتەی چۆنە؟ ئەویش شـانی دابەزیوەو ســەری شـۆڕکردۆتەوە بۆ خــوارەوەو بەحاڵە حاڵێك هەناســە دەدات، پاشان داوای لێدەکەم؛ شانەکانیو سەری بــەرز بکاتەوەو بەقووڵی هەناســە بدات، پاشــان لێی دەپرســم ئێسـتا هەســتت چۆنە؟ دەڵێت: هەسـت دەکەم ئێسـتا باشترم، منیش پێدەکەنمو پێی دەڵێم: کە ڕۆیشـتیتە دەرەوە، پارەکە لای سـکرتێرەکە دابنێ! ئەو ڕێگایەی، کە جەستەی پێ دەجووڵێنیت، کاریگەری هەیە لەسەر هەستو نەستت.

# پێشەوا ئەبوحەسەنی نەدەوی
## ١٣٣٢ - ١٤٢١ کۆچی

بەرزان ئەبوبەکر

زانایەکی خوداپەرست، بانگخوازێکی تێکۆشەر، ئەدیبێکی جوانناس لە شێوەو شێواز، ڕاستگۆ لە قسەکردنو نووسین، پێشەوا بانگخوازێکی گەورەو ناودار، خاوەنی پەرتووکگەلێك کە بە ناودارترین پەرتووکە ئاینییەکانی ئەم سەردەم دادەنرێت، بەناوبانگترین کتێبی بە ناونیشانی (بە هەڵوەشانی موسوڵمانان جیهان چ زیانێکی کردووە؟).

پێشەوا بلیمەتێکی درەوشاوە بوو، پێشەوا نەدەوی دیاردەیەکی هزری کە جوانترین بۆچوونی هەبووە لە بانگەوازدا، زانستخواز بووە، لە پێناوی دینو موسوڵمانانو سەرخستنی ئیسلامو شارستانییەتی ئیسلامیدا نارەحەتیو دەردەسەریی زۆری چەشتووە.

سەرەتای ژیانی پێشەوا نەدەوی:

پێشەوا لە گوندی تەکییە، لە وڵاتی هیند ساڵی ١٣٣٢ کۆچی بەرامبەر ١٩١٣ زاینی لەدایکبووە، باوکی مێژوونووسو خاوەنی چەندین بەرهەم بوو، لەوانە (نزهة الخواطر وبهجة المسامع والنواظر فی تراجم علماء الهند وأعيانها). بەڵام قەدەر وابوو پێشەوا سوودی ئەوتۆ، لە زانستەکەی باوکی نەبینێت، چونکە پێشەوا لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بوو کە باوکی ماڵاوایی لە ژیان کرد، دایکو براکەی، پەروەردەکردنو بەخێوکردنیان گرتە ئەستۆ، کە براکەی بەڕێوەبەری کۆڕی گەورەی زانایان بوو.

لەسەر دەستی دایکی، فێری قورئانی پیرۆزو هەردو زمانی ئۆردوو فارسی بوو، پاشان بە ساڵێك دوای کۆچی دوایی باوکی، دەستیکرد بە فێربوونی زمانی عەرەبی، پێشەوا یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر گرنگی بە فێربوونی زمان دەدا، یەکێکی دیکە لەو زمانانەی، کە فێری بوو، زمانی ئینگلیزی بوو، بۆئەوەی گرنگی بە زانستەکەیان بداتو وەکو چەکێك لە بانگەوازکردنەدا بەرەو حەقو ڕاستی بەکاری بهێنێت.

دواتر لە سەردەستی شێخ (خلیل کوڕی محمدی یەمەنی) هەوڵی پەرەپێدانی زمانی عەرەبی دا، تا بوو بە شەیدای ئەدەبی عەرەبی، (وعنى عناية خاصة بالعكوف) هەر سێ کتێبی (نهج البلاغة، دلائل الإعجاز، والحماسة)، پاشان پەیوەندی کرد بە بەشی زمانی عەرەبی زانکۆی (لەکنەو) کۆلێژی ئاداب، کە زانکۆیەکی یەمەنی بوو، خوێندن تێیدا بە زمانی ئینگلیزی بوو، پێشەوا بچووکترین خوێندکاری زانکۆ بوو.

ماوەی دوو ساڵ، زانستی فەرموودەی لە (کۆڕی زانایان خوێندووە)، پاشان بووەتە مامۆستا، لە خانەی زانیاری، کە سەربە کۆڕی زانایان بوو، لە ساڵی ١٩٣٤، زانستەکانی تەفسیرو فەرموودەی گوتووەتەوە، هەروەها ئەدەبی عەرەبیو مێژوو زانستی مەنتیقیشی وتۆتەوە.

بانگەوازی پێشەوا نەدەوی:

دیراسەو موتاڵاکردنی پێشەوا فراوانبوو، بە شێوەیەك، کە سنووری زانستی تەفسیرو فەرموودەو ئەدەبو مێژووی تێپەڕاند، پێشەوا سوودی لە کتێبی زاناو بانگخوازانی سەردەمی خۆی بینیوە.

لە ساڵی ١٩٤٨ هەڵبژێردرا بە ئەندامی ئەنجومەنی ئینتزامی (ئیداری) کۆڕی زانایان، دواتر پۆستی یاریدەدەری کۆڕی زانایانی پێبەخشرا، دوای وەفاتی براکەی د. عبدالعلي الحسني ساڵی ١٩٦١ بووە لێپرسراوی گشتی کۆڕی زانایان.

پێشەوا لە ساڵی ١٩٤٣دا، مەڵبەندێکی تایبەت بە فێربوونی زانستی ئیسلامی دامەزراند، کە تێیدا زانستی قورئانو زانستی فەرموودە دەگوترایەوە، کە زۆرینەی کەسانی ڕۆشنبیرو فەرمانبەران لەو مەڵبەندەدا دەیانخوێند.

دواتــر ســاڵی ١٩٥١، بزووتنەوەی پەیامــی مرۆڤایەتیی دامەزراند، هەروەها کۆمەڵگەیەکی زانستی ئیسلامی لە ســاڵی ١٩٥٩ دامەزراند، بەشــداری دامەزراندنــی دەزگای فێربوونــی ئاینی لــە ویلایەتەکانی باکــوور لە ســاڵی ١٩٦٠ کــردووە. هەروەها لە ســاڵی ١٩٦٤، بەشــداری ئەنجومەنی ڕاوێژکاری ئیســلامی بۆ تەواوی هیند کردووە. ساڵی ١٩٧٢ لە ئەنجومەنی باری کەسێتیی ئیسلامی بۆ تەواوی هیند بەشدار بووە.

### بەرهەمەکانی پێشەوا نەدەوی:

یەکەم وتاری بە زمانی عەرەبی، لە گۆڤاری منار، کە لە لایەن عەلامە (رشید رضا) دەردەچوو، ساڵی ١٩٣١، یەکەم کتێبی بە زمانی ئۆردو لە ســاڵی ١٩٣٨ بە ناونیشــانی (سيرة سيد احمد شهيد) بڵاو کردەوە. ساڵی ١٩٤٠ کتێبێکی بە ناونیشانی (مختارات من أدب العرب)ی دانــا، گرنگــی زۆری بە منــداڵان دەدا، دوو زنجیرە کتێبی بەو ناونیشانانە نووســیوە (چیرۆکی پێغەمبەران)و (القراءة الراشدة). پاشان لە ساڵی ١٩٤٤ دەستی کرد بە دانانی کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناونیشــانی (جیهان چ زیانێکی بە تێکشکانی موسوڵمانان کردووە)، لە ســاڵی ١٩٤٧ تەواوی کردو پێش ئەوەی سەفەری حەج بکات، بە زمانی ئوردو چاپ کرا، پێشەوا گرنگی بە بواری ڕۆژنامەوانی داوە، نووســەری گۆڤاری (الضياء) بووە، کە کۆڕبەندی زانایان بە زمانی عەرەبی دەری دەکرد، پاشان بووە سەرنووسەری گۆڤاری (کۆڕبەندی زانستی)، بە زمانی ئۆردو دەردەچوو، دواتریش گۆڤارێکی بە زمانی ئۆردو بە ناونیشــانی (التعمير) دەرکردووە. بە کورتی کۆی کتێبە دانــراوو وەرگێڕدراوەکانی ٧٠٠ ناونیشــانە، لەوانە ١٧٧ دانەیان بە زمانی عەرەبــی دانراوە، زۆرێك لە دانراوەکانــی وەرگێڕدراونەتە ســەر زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیو بنگالیو ئیندۆنیسیو چەندین زمانی دیکە.

**گەشتەکانی:** شــێخ نەدەوی، لە پێناوی فێربوونی زانستو گەیاندنــی زانســتەکەیو بانگەوازکــردن، گەشــتی زۆری ئەنجام داوە، یەك لە گەشــتەکانی بۆ شــاری (لاهوور) بوو لە ساڵی ١٩٢٩، ئەوە یەکەم گەشــتی بوو، بۆ وڵاتێکی دوور، لە گەشــتەکەیدا بە زانایانو هاوەڵانیان ئاشنا بوو، هەروەها چاوی کەوت بە شاعیری نــاودار (دکتــۆر محەممەد ئیقبال)، کە هەندێك لە شــیعرەکانی وەرگێڕاوەتە ســەر زمانی عەرەبی، هەروەها گەشــتی کردووە بۆ (دیوبند) لە ســاڵی ١٩٣٢، لە خانەی زانستی دیوبند ئامادەی کۆڕە زانســتییەکانی زانای پایەدار (حســین احمــد مەدەنی)بووە، کە زانایەکی لێهاتوو بوو لە زانســتی فەرمووددا، هەروەها ســوودی زۆری لە بوارەکانی زانستی تەفسیرو زانستی قورئاندا لێبینیوە.

هەروەها ســاڵی ١٩٥٦ بانگهێشــت کراوە بۆ زانکۆی دیمەشــق، چەند موحازەرەیەکی پێشــکەش کردووە بە ناونیشانی (التجديد والمجددون في تأريخ الفكر الاسلامي)، کــە دواتر کردوویەتیە کتێبێکی گەورە بە ناونیشانی (رجال الفكر والدعوة الإسلامية).

(شــێخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز) ساڵی ١٩٦٣ بانگهێشتی کــردووە بۆ مەدینەی پیرۆز. جەنابی شــێخ نــەدەوی لە زانکۆی مەدینەی پیــرۆز، چەندین موحازەرەی پێشــکەش کردووە، کە دواتر چاپکراوە بەناونیشانی (النبوة والأنبياء فی ضوء القرآن).

لــە ســاڵی ١٩٦٨، گەشــتی کــردووە بۆ شــاری ڕیاز، لەســەر بانگهێشــتی وەزیری خوێندنی باڵای سعودیە، بۆئەوەی بەشداری بــکات لــە تۆژینەوەیەك بۆ دانانــی پلان بۆ کۆلێژی شــەریعە، جەنابی شــێخ لە چوارچێوەی گەشتەکەیدا، چەندی موحازەرەی لە زانکۆی مامۆستایانو زانکۆی ڕیاز پێشکەش کردووە، دواتریش موحازەرەکانی کۆکراونەتەوەو بە ناونیشانی (بەرەو پەروەردەیەکی ئیسلامی ئازاد لە حکومەتەکانو وڵاتانی ئیسلامیدا) چاپکراوە.

جەنابی شێخ لە گەشتەکانی بەردەوام بووە، تا ئەو ساتەی بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

### ڕێزلێنانەکانی شێخ نەدەوی:

* شــێخ نەدەوی لە ســاڵی ١٩٦٢، لە مەککــەی پیرۆز یەکەم دانیشتنی دامەزراندنی (رابطة العالم الاسلامی) بەڕێوە بردووە، لە جیاتی موفتی گشتی (شيخ محمد بن شيخ ابراهيم)وڵاتی سعودیە، کە لە ســەرەتای دانیشــتنەکەدا خودی ســەرۆکی ســعودییە (بن عبدالعزيز)ئامادەی دانیشتنەکە بوو، هەروەها پادشای وڵاتی لیبیا ئامادە بوو، چەندین کەسایەتیو ناودارانو زانایان بەشدارییان لە دانیشــتنەکەدا کردووە، جەنابی شێخ نەدەوی وتارێکی پێشکەش کرد، بەناونیشــانی (الاسلام فوق القوميــات والعصبيات)، واتە: ئیسلام لە سەرو نەتەوەگەریو دەمارگیرییەوەیە.

* بەرامبەر ئەو خزمەتە بێشــومارەی پێشکەشی کردووە، لە ساڵی ١٩٨٠، خەڵاتی پاشا فەیصەلی وەرگرتووە.

* ڕابیطــەی ئەدەبــی ئیســلامی جیهانــی دامەزراندووە، لە ســاڵی ١٩٨٤، کە خــودی جەنابی شــێخ، بۆ ســەرۆکی ڕابیطەکە هەڵبژێردراوە.

* ســاڵی ١٩٩٨، لــە مەڵبەندی ئۆکســفۆرد بــۆ توێژینەوەی ئیســلامی، خەڵاتــی ســوڵتان حەســەنی بەلقی وەرگرتــووە، لە بەرامبەر بابەتی (سير أعلام الفكر الإسلامي).

* ڕێکخراوی ئیسلامی بۆ پەروەردەو زانســتو ڕۆشنبیری (ئایسێســکۆ **ISESCO**) خەڵاتی کردووە لە بەرامبەر بەخشینی ئــەو زانســتە نــاوازەی هەیبــووە، وەك ڕێزێك بۆ ئــەو هەموو خزمەتەی پێشکەشی ڕۆشنبیری ئیسلامی کردووە.

### ماڵاوایی هەمیشەیی شێخ نەدەوی:

لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی، ٢٤ ڕەمەزانی ســاڵی ١٤٢١ کۆچی بەرامبەر ١٩٩٩ زایینی، جەنابی شــێخ نەدەوی خۆی دەشــۆرێتو دەڕوات بۆ لای قوتابییەکانیو داوایان لێدەکات، کە سورەتی کهف بخوێنن، بەڵام پێش ئەوەی قوتابییەکانی سورەتەکە تەواو بکەن، جەنابی شێخ چاوەکانی لێکناو ڕۆحە پاکەکەی لە جەستەی جودا بووەوە، دوای ئەوەی دنیای پڕکرد لە زانستو زانیاری..

**پوختــە:** شــێخ نەدەوی یەکێــك بوو لەو منداڵانــەی، کە لە تەمەنــی نــۆ ســاڵاندا، باوکی ماڵاوایــی لە ژیان کــردووە، بەبێ باوکی گەورە بووە، بەڵام توانیویەتی ببێت بەو زاناو کەســێتییە لێهاتــووەی، کە ئێمە تەنها مشــتێك لە خەرواری تەمەنیمان لەم ژمارەیــەدا باس کــردووە. بێباوك گەورەبووە، بــەڵام ناوی، بەناو هەموو جیهاندا بڵاوبووەوەو کەم زانستخواز هەیە، ناوی ئەم زانا پایەدارەی نەبیســتبێت.. بە زانســتو زانیارییەکەی، بۆ هەمیشە ناوی لە نێو کۆڕی زانایاندا زیندووە.

# جوانییەکانی شەو!

جەلال عەبدوڵا حاجی

مرۆڤ حەزی بەتاریکی نییە، کاتێکیش لە شوێنێکی تاریکدا دەبێت، خەو زۆری بۆ دەهێنێت، تاریکی شەو، ڕێگر بووە لەبەردەمیدا بۆ ڕاپەڕاندنی کارو فرمانەکانی. لە تاریکیدا، زۆرجار زیانی پێگەیشتووە، بۆیە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە؛ دڕ بەتاریکی بداتو شەو ڕووناك بکاتەوە، خودای گەورە ڕۆژی داناوە بۆ کارکردنو شەویش بۆ حەوانەوەو خەوتن، بە هاوسەنگییەکی ڕێکو جوان، بەڵام مرۆڤ بەردەوام خەریکی تێکدانی ئەم هاوسەنگییەیە، هەرچەندە پێشدەکەوێت، گرفتو تێکدانی زیاتری لێدەکەوێتەوە. داهێنانی گڵۆپ، شێوازی ژیانی مرۆڤی گۆڕی، گڵۆپ بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ بوو لە تاریکی، کەچی ئێستا زۆر شار هەیە، بەشەو ناخەونو گڵۆپەکان بەشەوو ڕۆژ داگیرساون.

ئەم گۆڕانە، تەنها کاریگەری لەسەر مرۆڤ نییە، بەڵکو کاریگەری لەسەر ژینگەو گیانلەبەرانیش هەیە، پێی دەگوترێت: پیسبوون بە ڕووناکی، پیسبوونی ژینگە، هەر ئەوە نییە؛ مادەی زیانبەخشو ژەهرو تیشکی ناوەکی بکرێتە ناو ژینگەوەو کاریگەری هەبێت لەسەر تەندرووستیی مرۆڤو ڕووەكو گیانلەبەران، بەڵکو هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە، کە زیانیان هەیە بۆ جوانیی ژینگەو ئەو زیانەشی، کە بەشێوەی ڕاستەوخۆ دەرناکەوێت، بەڵام کاریگەرییان کەڵەکە دەبێتو لە داهاتوودا دەردەکەون.

دەتوانین پیسبوون بە ڕووناکی، کورت بکەینەوە بەوەی؛ لە ئەنجامی بەکارهێنانی بڕێکی زۆری ڕووناکی، بە توندییەکی بەرز، دەبێتە هۆی زۆر کێشەی تەندرووستی، مرۆڤ توانیویەتی زاڵ ببێت بەسەر تاریکیی شەوداو چراخانێك درووست بکات، خەڵکی بەشەو کارەکانیان ڕادەپەڕێنن، سەفەر دەکەنو بە شەقامو کۆڵانی شارەکاندا دەسوڕێنەوە.

لە وڵاتی بەریتانیادا، نزیکەی (حەوت ملیۆنو نیو) گڵۆپی سەر ڕێگا هەیە، هەموو ساڵێك نزیکەی(سەد هەزار)ی تری بۆ زیاد دەکرێت، هەروەك لە وێنەی مانگە دەستکردەکانەوە دیارە، لە شەودا وێنەی زەوی دەگرن، وڵاتانی تریش زۆریان بەم شێوەیەن، هەربۆیە گرفتی پیسبوونی ژینگە بە ڕووناکی درووست بووە، ئەم دیاردەیە لە شارەکانی کوردستانیشدا دەبینرێت، بەسەر ئاسمانی هەموو شارێکەوە لە شەودا، چینێکی پرتەقاڵی دەبینین، بەهۆی گڵۆپەکانی شەقامو کۆڵانەکانەوە، ڕووناکییەکەیان بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، بەهۆی تۆزو مادە پیسکەرەکانی هەواوە، تووشی شکانەوە دەبنو ئەم دیاردەیە، درووست دەکەن.

بەپێی سەرژمێرییەکانی کۆمەڵەی شیکاگۆ بۆ باڵندە، ساڵانە نزیکەی (سەد ملیۆن) بۆ (یەك ملیار) باڵندە دەمرن بەهۆی بەرکەوتنیان بە باڵەخانە بەرزەکانەوە، چونکە توانای دیاریکردنی ئاڕاستەیان لەدەست داوە؛ بەهۆی ڕووناکیی شارەکانەوە، هەروەها گیانلەبەرانی شەو، وەك جاران ناگەڕێن بەدوای خۆراکدا، ورچە جەمسەرییەکان پەلاماری سەرچاوەکانی ڕووناکی دەدەن، چونکە پێی بێزار دەبن، هەندێك باڵندە بەرەبەیان دەخوێنن، بەڵام ئێستا بەهۆی ڕووناکی زۆرەوە، لەشەودا دەخوێنن، ناتوانن جیاوازی بکەن لە نێوان بەرەبەیانو ڕووناکیی گڵۆپدا.

ڕووناکیی ڕیکلامەکانی سەر ڕێگاو گڵۆپی ئۆتۆمبێلەکان، یەکێکی ترن لە سەرچاوەکانی پیسبوون بە ڕووناکی، ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لە گیانلەبەرە کێویەکان، لە شەودا دەبنە قوربانی بەهۆی شەوارەکردنەوە بە ڕووناکیی گڵۆپی ئۆتۆمبێلەکان، خراپ بەکارهێنانی گڵۆپی ئۆتۆمبێلەکان، چەندین ڕووداوی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوە. هەروەها ڕووناکیی تەلەفزیۆنو کۆمپیوتەر، کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر چاوو کۆئەندامی دەمار، چونکە بڕێکی زۆرو بۆ ماوەیەکی زۆر، بەرچاو دەکەوێت، ڕێژەیەکی زۆر لە منداڵان، چاویان کز بووە؛ بەهۆی هۆگربوونیان بە سەیری تەلەفزیۆنو یارییەکانەوە.

ئێستا لە هەموو دنیادا، ئەستێرەناسەکانو ئەوانەی گرنگی بەدیاردە گەردوونییەکان دەدەن، ناچاربوون شار بەجێ بهێڵنو ڕووبکەنە ناوچە دوورە دەستەکان، بەناچاری ناوەندەکانی چاودێری ئاسمان لە شارەکان دوورخرانەوە. بەهۆی پیسبوون بەڕووناکی ناتوانین وەك مرۆڤەکانی پێشوو جوانی شەو ببینین، بەتایبەت ئاسمانی جوانی پڕ لە ئەستێرە، ڕێگەی کاکێشان، ئەستێرەی کاروانکوژە، گەلاوێژ، کۆ، شیرینو فەرهاد، تەرازوو (شایەن)، سیوەیل، حەوتەوانەی گەورەو بچووك، مانگو کەلووەکان نابینین، بەجۆرێك نەوەی نوێ، هیچ زانیارییەکیان لەبارەی ئەستێرەکانو وەرزی دەرکەوتنیان، ئاڕاستەو، سوودو جوانی ئەو ئاسمانە بەرینە هیچ نازانن، لە کاتێکدا باوباپیرانمان، بەبێ کاتژمێر کاتی بانگی شێوانو بەرەبەیانیان دیاری کردووە، وەرزەکانی ساڵ، کاتی هەستان بۆ زەوی کێڵان، ئاڕاستەی باکوورو باشوور، هۆکاری ئەمە ڕەنگە بگەڕێتەوە؛ بۆ گۆڕانی شێوازی ژیانی ئێمەی کورد، بەڵام بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە؛ بۆ پیسبوونی ئاسمانی شارەکان بە ڕووناکی، لەکەیەوە بەشەو لە ئاسمانت نەڕوانیوە؟ لە ئاسمان ڕابمێنەو دەروونت پڕکە لە ئارامی..



# ئەندرۆ کارنگی

## (١٨٣٥ - ١٩١٩)

زۆرێک لە خەڵکی لەو باوەڕەدان، کە سەرکەوتن لە سەرەتاکانی سەدەی ڕابردوودا، بە بەراورد بە کۆتایی سەدەی ڕابردوو، زۆر ئاسانتر بوو، بەڵام لە ڕاستیدا هەموو سەدەیەک، تەنگژەو نارەحەتیی خۆی هەیە، هەموو چاخێك، چاکیو خراپی هەیە، نەبوونی ڕێگاکانی سەرکەوتن، هۆکارەکانی بەردەست لە تەکنەلۆژیاو بەرەوپێش نەچوونی بواری پیشەسازی وەکو ئێستا، لەو هۆکارانەن، کە زۆرێك لە خەڵکی پێیان وایە، ئاستەنگی بەردەم سەرکەوتن بوون، بەڵام لە هەموو بارودۆخێکدا، ناکرێت بەراورد لە نێوان ئەو دوو کاتەدا بکرێت، بە تایبەت سێ بەشی یەکەمی سەرەتای سەدەی بیست، تێیدا دوو جەنگی جیهانی ڕوویان داوە، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر بوارەکانی ئابووریو بازرگانی جێ هێلاوە، لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە، ئەو سەردەمە، خاڵی بووە لە هەموو هۆکارێکی پێشکەوتن؛ پەیوەندی، گەیاندن، کۆمپیوتەرو چەندین شتی دیکە.. کەواتە: سەرەتاو کۆتایی ئەو سەدەیە، لە ڕووی زۆرینەی هۆکارەکانی ژیانەوە، زۆر جیاوازبوون.

لە بەناوبانگترین بازرگانەکانی ئەو کاتە، (ئەندرۆ کارنگی) بوو، ناوبانگی بە بازرگانێکی پۆڵایینو بەهێزی ئەو سەردەمە دەرکردبوو، بەوە ناسرابوو کە حەز بە بەخشینو کاری چاکەو پرۆژەی خێرخوازی دەکات، لەو کەسە دەگمەنانە بوو، کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا، زۆربەی سەروەتەکەی، بە هەژارانو نەداران بەخشیوە.

(ئەندرۆ کارنگی) لە ساڵی (١٨٣٥) لە ئیسکۆتلەندا لەدایکبووە، باوکی کرێکاری ڕستنو چنین بووە، زۆر هەژارو کەم دەرامەت بوون، لەدایکبوونی هاوکات بوو لەگەڵ کردنەوەی دەروازەی شۆڕشی پیشەسازی، کرێکاری ڕستنو چنین، هیچ پێویستییەکی بە ئامێری پێشکەوتوو نەبووە، لەبەرئەوە هیچ کێبڕکێیەك لە نێوان کرێکارەکاندا بوونی نەبووە.

بۆ بەردەوامی ژیانو پەیداکردنی بژێوی ژیان، دایکی ئەندرۆ، بەناچاری کاری لە چاککردنەوەو دوورینەوەی پێڵاودا کردووە، ئەو کات ئەندرۆ منداڵ بوو، لە تەنیشتی دایکییەوە دادەنیشتو دەرزییەکەی بۆ هەڵدەگرتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی دایکی دەیویست؛ منداڵەکانی ژیانێکی خۆشو ئاسوودە بەسەر بەرن،ماڵیان گواستەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو کات ئەندرۆ تەمەنی تەنها ١٢ ساڵان بوو.

باوکی ئەندرۆ، لە کارگەیەکی لۆکە کاری دەکرد، ئەندرۆش لەگەڵیدا دەڕۆیشت بۆ کارکردن بە کرێی تەنها یەك دۆلارو بیست سەنت، لە هەفتەیەکدا، پاشان گواسترایەوە بۆ کارێکی دیکە کە وەکو نێردراوی نووسینگەی بیتسبۆرگ بۆ پۆستو تەلەگراف.

ئەندرۆ ڕازی نەبوو، کە دەستەوسان دابنیشێتو نەڕواتە قوتابخانە، لەبەرئەوە خۆی زۆر سەرقاڵ کرد بە خوێندنەوەوە، زیاتر بە کتێبە سیاسیو مێژووییو زانستییەکانی دەخوێندەوە، لە تەمەنی هەرزەکاریدا، بابەتی بۆ ڕۆژنامەکان دەنووسی، لە نیۆرك، چەندین ڕاوبۆچوونی ناوازەی هەبووە سەبارەت بە کۆیلایەتیو خراپییەکانی ئەو دیاردەیە.

ئەندرۆ کاتێك لە نووسینگەی پۆستدا کاری دەکرد، توانی بڕی (٥٠٠) دۆلار لە ماوەی کارکردنیدا کۆ بکاتەوە، کە ئەم بڕە پێویستی بە ماوەی (١٠)ساڵ کارکردن بوو لەو کاتەدا. پاشان پلەی بەرزبووەوەو بوو بە کرێکاری تەلەگراف، ئەندرۆ کەسێکی وردەکار بوو، یەکەم کرێکاری تەلەگراف بوو، کە توانی نامەکان، بە دەنگ جیا بکاتەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بۆ جاری دووەم پلەی بەرز بکرێتەوە، بەمەش مووچەی مانگانەکەی گەیشتە ٣٥ دۆلار، خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: هەرگیز لە ژیانمدا، بەخەیاڵمدا نەهاتووە، کە ببم بە خاوەنی ئەو بڕە پارەیە.دواتریش لە هێڵی ئاسنینی پەنسیلڤانیا دەستی بەکارکردن کردووە.

ئەندرۆ هەمیشە بە دوای هەلو دەرفەتدا دەگەڕا، زۆری پێنەچوو ئەو هەلەی بۆ هەڵکەوت، بە هۆی ئەو لێهاتوویی‌و چالاکییەوە کە لە ماوەی کارکردنیدا ئەنجامی دا، توانی ببێتە سکرتێری یەکەمی (تۆماس سکۆت)؛ بەڕێوەبەری بەشی ڕۆژئاوا لە بنکەی پەنسیلڤانیا، تۆماس ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە ژیانیدا.

ئەندرۆ لە ماوەی ئەو دوانزە ساڵەدا، لە هێڵی ئاسنین کە لەگەڵ تۆماسدا کاری کرد، فێری کاری بەڕێوەبردن‌و بازرگانی بوو، بە هۆی گەشبینی‌و ورەی بەرزو تواناو لێهاتووییەکانییەوە، توانی ببێتە بەڕێوەبەری بنکەی هێڵی ئاسنین. تۆماس، ئەندرۆی خستە نێو جیهانی وەبەرهێنانی دارایی‌و سامانەوە.

لەگەڵ کۆتاییهاتنی ساڵی ١٨٦٣، قەبارەی پشکەکانی ئەندرۆ، لە سکەی شەمەندەفەرو نەوتدا، ساڵانە گەیشتە نزیکەی ٤٥٠٠٠ دۆلار.

دوای شەڕی ناوخۆ، هێڵی ئاسنین گەشەی سەند، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەندرۆ، وەکو خۆبەخشێک کار بکات، بەتایبەت لە ماوەی شەڕی (پول ڕان) کە بریندارەکانیان لە ڕێگەی هێڵی ئاسنینەوە دەگواستەوە.. هەروەها پیشەسازی‌و پردو سکەی شەمەندەفەر، گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، ئەوەش سەرنجی ئەندرۆی ڕاکێشا.

لە ساڵی ١٨٦٢، لەگەڵ تۆماس سکۆت‌و چەند کۆمپانیایەکدا، کۆمپانیایەکیان بە ناوی (**keystone bridge company**) بۆ درووستکردنی پردی ئاسنین دامەزراند.

لە ساڵی ١٨٦٥، ئەندرۆ وازی لە کاری هێڵی ئاسنین هێنا، تەرکیزی خستە سەر پردی ئاسنین، توانی چەند گرێبەستێک ڕێک بخات، کە لە ڕێگەی کارکردنی لە هێڵی ئاسنینەوە دەستی کەوتبوو، کە بووە هۆی زیاتر پەرەپێدان‌و سەرکەوتنی کۆمپانیای پردی ئاسنین لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەندرۆ لەو بوارەدا، بوو بە بازرگانێکی گەورە، توانی بۆ ئەو مەبەستە کارگەیەکی زەبەلاح لە بیتسبۆرگ دابمەزرێنێت.

ستراتیژیەتی ئەندرۆ کارنگی، لەو بوارەدا پشتی بەست بە بەرزکردنەوەی کوالێتیی جۆری پۆڵاو لە هەمان کاتدا، دابەزاندنی نرخی فرۆشتنی، ئەوەش بووە هۆی فراوانی کارەکەی‌و گەورەبوونی بەشێوەیەکی بەرچاو، ئەندرۆ بوو بە کەسێکی زۆر ڕێکخراو، بەرنامەی ئەندرۆ، بە باشترین جۆری بەرنامەی حیسابات دادەنرا لەو کاتەدا. هەمیشە دەیگوت: چاودێری خەرجی‌و داهات بکە، ئەوانی دی خۆیان چاودێری خۆیان دەکەن.

لە سیاسەتە سەرکەوتووەکانی کارنگی: کەسانی لێهاتوو لێزان‌و بەتواناو شارەزای لە دەوروبەری خۆی کۆکردبووەوە، جارێکیان یەکێک لە هاوکارەکانی، پێشنیاری بۆ کرد، کە لەسەر گۆڕەکەی بنووسن: (لەم گۆڕەدا پیاوێک هەیە، کە توانیویەتی سەرنجی کەسانی لە خۆی زیرەکترو داهێنەرترو شارەزاتر ڕابکێشێت!).

ئەندرۆ زۆر هاوکارو یارمەتیدەری کەسانی چواردەوری بوو، زیاد لە پێویست گرنگی بە کارمەندو هاوکارەکانی دەدا، ئەو هەمیشە بەرژەوەندی کارمەندو هاوکارەکانی دەخستە پێش بەرژەوەندی ئاسن‌و کارگەکانییەوە، سەرەنجام زۆرێك لە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکەی بوونە کەسانی دەوڵەمەند.. لەوانە (چارلز شواب).

ئەندرۆ کارنگی، تا ئەو ساتەی دایکی لە ژیاندا بووە، هاوسەرگیری ئەنجام نەداوە، وەکو وەفایەك بۆ دایکی، نەبادا هاوسەرەکەی ببێت بە هۆی دوورخستنەوەی لە دایکی ئەزیزی، بەڵام لە ساڵی ١٨٨٧و دوای ئەوەی دایکیماڵاوایی لە ژیان کرد، ئەندرۆ لە تەمەنی ٥٢ ساڵیدا لەگەڵ خاتوو (لویز ویتفێلد) کە ئافرەتێکی ژیرو عاقڵ‌و هۆشمەند بوو، هاوسەرگیری ئەنجام دا، کاتێك ئەندرۆ کارنگی بڕیاری دا زۆرێك لە سەروەتەکەی ببەخشێتە بە هەژاران‌و کەمدەرامەتان، هاوسەرەکەی هیچ ڕێگرییەکی لێ نەکرد.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە سەرۆکایەتی ئەندرۆ کارنگی، توانی بە پیشەسازی ئاسن‌و پۆڵا، پێداویستیی وڵاتێکی وەك بەریتانیا لەو بوارەدا پڕبکاتەوە.

دواجار ئەندرۆ کارنگی، بڕیاری دا خۆی یەکلابکاتەوە بۆ کاری خێرخوازی، کاتێك تەمەنی شەستو پێنج ساڵی تێپەڕاند، واتە: لە ساڵی ١٩٠١ کۆمپانیاکەی بە بڕی چوار سەد ملیۆن دۆلار فرۆشت.

فەلسەفەی ئەندرۆ کارنگی، زۆر ڕوون بوو، (خۆشترین ساتەکانی ژیان، ئەو کاتەیە کە هەست دەکات بووەتە خاوەنی سەروەتو سامانێکی زۆرو دواتریش دەیبەخشێت بە هەژاران‌و بێنەوایاندا، لە کاتێکدا خۆت لە ژیاندایت)، هەروەها پێش ئەوەی ماڵاوایی لە ژیان بکەیت: هەست بە بەختەوەری ئەو کەسانە بکەیت، کە توانیوتە یارمەتییان بدەیت، کە هێشتا تۆ لە ژیاندایت، هەروەها دەڵێت:

خراپترین شت ئەوەیە؛ کە مرۆڤ ببێت بە کۆیلەی ماڵ‌و سامان!

ئەندرۆ کارنگی، ژیانی مرۆڤ دەکاتە بە دوو بەشەوە: بەشێکی بۆ کۆکردنەوەی سامان.. بەشێکی بۆ خەرجکردنی سامان..

کارنگی توانی ٢٨١١ کتێبخانەی گشتی دابمەزرێنێت.. کە زۆربەیان لە بواری پزیشکی‌و فێرکاری بوون.

کارنگی لە ماوەی ١٠ ساڵدا، زیاتر لە ٣٥٠ ملیۆن دۆلاری بەخشیوە، دوای ئەوەی لە کارکردن‌و سەرقاڵییەکانی ژیان ماندوو بوو، بڕیاری دا پشوو بدات، لە پێش ئەم بڕیارەدا کۆشکی سەلامی لە **Hague** درووست کرد.

کارنگی چەندی کتێبی نووسیوە، ئەو کەسێکی نیشتمانپەروەرو بەڕێزو بەخشندە بووە، بە تایبەت لە کاتی تەنگژەی ئابووریدا ئەندرۆ کارنگی، چەندین کارگەی دامەزراند، کارو بازرگانییەکەی بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، گەشەی سەندو ناوبانگی باشی پەیدا کرد.

ئەندرۆ کارنگی، لە ساڵی ١٩١٩، لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا، ماڵاوایی لە ژیان کردو هاوسەرەکەی‌و کچەکەی بەجێهێشت. بەڵام ئەو لە ڕێگەی فەلسەفە بازرگانییەکەی‌و کارە خێرخوازییەکانییەوە، بەردەوام ناوی زیندووەو مرۆڤایەتی وەکو کەسێکی بەئەزموون‌و خێرخوازو چاکەکار، هەمیشە وەکو نموونە باسی لێوەدەکات.

# یەك جار نەفرەت لەوەی دیکتاتۆری دەکات، دووجار نەفرەت لەوەی دیکتاتۆر درووست دەکات

شالاو سدیق ڕەسوڵ

دەگێڕنەوە لە ولاتێك، پاشـایەکی زۆر دادپەورەر دەبێت، ئەم پاشـایە، هەموو ژیانی پاشـایەتی، بۆ خزمەتکردنی ولاتەکەیو یارمەتیدانـی خەڵکـی، تەرخـان دەکات.. بـەڵام خەڵکـی ولات، سەرەڕای دادپەروەریو دڵسۆزیی جەنابی پاشا، هەر لێی ناڕازینو بەردەوام گازەندەو گلەیی لێدەکەن..

وەك هەمیشـە، پیلانگێڕان چاویان بە دادپەروەری هەڵنایە، پیلانێك بۆ کوشـتنی پاشـای دادپـەروەر دادەڕێـژن، ڕۆژێك بە هـەر هۆیـەك بێت، پاشـا لە کۆشـك دەبەنـە دەرەوە، لە کاتی دوورکەوتنـەوەی پاشـا لە شـار، پیلانگێڕان بە پیلانێك پاشـا لەناو دەبەنو دەیکوژن، دواتر تەرمی پاشـا دەهێننەوە بۆ کۆشك. خەڵکی شـار، لە جیاتی شینو گریان، ئاهەنگو شادی دەگێڕن بە لەدەستدانی پاشاکەیان.

دوای ئەسـپەردەکردنی تەرمی پاشـا، خەڵکەکە دەگەڕێنەوە بۆ کۆشـكو بیـر دەکەنەوە لـە هەڵبژاردنی پاشـایەکی نوێ بۆ ولات، بڕیار دەدەن، کە کەسـێك دابنێن؛ هیچ شتێك لە کاروباری پاشـایەتی نەزانێت، هەر بۆیە کەسێك دادەنێن، کە لەوەو پێش، لە یەکێك لە گوندەکانی نزیك شـاردا، شـوانی مەڕو ماڵات بووە، دەڕۆن کابرای شوان دەهێننو پێی دەڵێن: دەتکەین بە پاشای ولات، بە مەرجێك لە قسـەمان دەرنەچیت، کابرای شـوانیش، کە هەر پیشـەی شوانی بووە، بەوپەڕی سەرسامیو خۆشحاڵییەوە قبووڵی دەکات، لەبەر خۆیەوە دەڵێت: کێ خودا دەیداتێ؛ لە شوانی مەڕو ماڵاتـەوە، بیکـەن بە پاشـای ولات، کابرای شـوان دەهێنن جلی پاشـایەتی دەکەنەبەریو دەچێتە سـەر تەختی پاشایەتی، چەند ڕۆژێك ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی هەڵبژاردنی پاشـای نوێوە بۆ ولات، پاش تەواوبوونی ڕێوڕەسـمی پاشایەتی، بەردەستەکانی بە پاشـا دەڵێن: فەرمان بەچـی دەکەی باجێبەجێـی بکەین بۆت، فەرمـان دەدات بە درووسـتکردنی سـوپایەکی بەهێزی تایبەت بەخۆی، دوای ئەوە پارەیەکی بێشوماری ولات، بۆ مەبەستەکانی خـۆی بەهـەدەر دەدا، خەڵکی هـەژار دەچەوسـێنێتەوە، دزیو کوشـتنو لەناوبـردنو زووڵـمو سـتەم زۆر دەبێت، بەوەشـەوە ناوەسـتێت، موڵكو زەوییەکانی خەڵکی، دەکات بەناوی خۆیەوە، خەڵکی بێئاگان لە پاشا، وادەزانن هەر شوانە نەزانەکەی جارانە، وردە وردە کارە ناڕەواکانـی پاشـا لەناو خەڵکیـدا بڵاودەبێتەوە، خەڵکـی بڕیار دەدەن؛ پاشـا لەناوبەرن، کەبەم چەشـنە بووەتە دیکتاتۆر بەسـەر خەڵکییەوە.. لەم کاتەدا؛ پەشیمانی دەردەبڕن، کە پاشا دادپەروەرەکەیان لەناو برد، هەموو خەڵکی کۆ دەبنەوەو دەچنـە بەردەمی کۆشـکی پاشـاو بە یەك دەنگ هـاوار دەکەن: نەفرەتت لێبێت ئەی دیکتاتۆری ستەمکار، دەبێت لەناو ببرێیت، پاشـا کە گوێی لەم قسـانە دەبێت، لە کۆشـك دێتە دەرەوەو بە خەڵکەکە دەڵێت: ئەی خەڵکینە ڕێگەم بدەن، با چەند قسـەیەك بکەم، کە هەر قسـەیەك وانەیەکە بۆ ئێـوە، پێیان دەڵێت: ئێوە تاوانـی خۆتانە، کە من سـتەمتان لێدەکـەم، لەبەرئەوەی ئێوە ستەمکاربوون بەرامبەر بە پاشاکەی پێش من، بۆیە خوای گەورە زەواڵی بۆ ناردن، هەروەها ئێوە یەکجار نەفرەت لەو کەسە بکەن، کە دیکتاتۆری دەکات، بەڵام دووجار نەفرەت لەو کەسە بکەن، کە دیکتاتۆر درووسـت دەکات، ئێوە خۆتـان منتان فێری دیکتاتۆری کرد، ئەو کاتە زانیم، کە ئێوە گێلو نەفامن، کە هەرچییەکم وت بە قسـەتان دەکردم، ئیتر هیچیان لەگەڵ پاشـا بۆ نەکرا، کاکی شوانیش تاکۆتایی تەمەنی، هەر بە پاشایەتی مایەوە.

خوشكو برا بەڕێزەکانم؛ سەرکەوتوو ئەو کەسەیە، لە دژوارترین کاتەکانی ژیانیدا، حەق بێژ بێت، با بارودۆخیش لە بەرژەوەندی ئەودا نەبێت، ئەگەر زۆربەی خەڵکی لە دژت بن، لەبەر وتنی ڕاستی، بێترس بە؛ سـەرکەوتوو تۆیت، چونکە نەوتنی ڕاسـتی، پێـش هەموو کەس، هەنگاوێکـە بۆ کەوتنی خۆت، ئێمە بۆئـەوە لەدایك نەبووین، چەپڵە بۆ ناحەقو سـتەمکار لێبدەین، بۆئەوە هاتووینە دنیاوە، پەردە لەسەر شـتگەلێك لا بدەین، کە نامۆو شـاراوەن، ڕاسـتی ژەهرێکی زۆر تاڵە، تەنها کەسە ئازاکان دەتوانن بیخۆنەوە، چونکە نایانەوێت ژێردەستەبن! ئەیانەوێ سەربکەون بەرەو لووتکە.



# خۆت بە!



سایە سەرگەتی

ئەو کەوە خاتوونە، زۆر جوان ڕێ دەکات، هیچ نمایشکارێکی جلوبەرگ، هێندەی ئەو سەلیقەی ڕێکردنی نییە. خاتوو قەلەڕەش بێزاربوو، هێندە لە پشت بەردەکان وەستاو سەرنجی خاتوو کەوی دا، بەڵام هەر فێرنەبوو، بۆیە بە ڕاشکاوی، چووە لایی‌و تێی گەیاند؛ کە دەیەوێت فێری هونەری ڕێکردنی کەو بێت. ڕۆژان تێپەڕی، خاتوو کەو زۆر بە نیازپاکی تەواوی نهێنی چەند ساڵەی، بنەماڵەکەیانی بۆ شیکردەوە، بەڵام ئەنجامەکەی چی بوو؟ لە ئەنجامدا قەلەڕەش نەفێری ڕێڕۆشتنی کەو بوو، نە ڕێڕۆیشتنی خۆی بیر مابوو، لەبەرئەوە تا ئێستەش، کاتێک قەلەڕەش ڕێ دەکات، هەردوو پێی پێکەوە دەجووڵێنێت.

ئەستێرەیەک زۆر چاوی لە دەرو دراوسێ بوو، ماوەیەک چاوی بڕی بووە ژیانی هەور، هەمیشە خۆزگەیی دەخواست، وەک ئەو ئازاد بێت لە گەڕان، ڕێجیمی دنیایی کرد، تا بوو بە هەور، بێ خەیاڵ لەوەی ژیانی هەور چەند ڕۆژێکەو ئەنجامەکەی توانەوەو نەمانە.

خاتوونێک ئەو جلە نەتەوەییەی دۆزییەوە، کە لە داپیرییەوە بە دیاری بۆی بەجێ مابوو، خاتوونیش قۆڵەکانی کورت کردەوە، گوڵێکی دا لە دامێنی‌و بەرزی کردەوە، کۆڵوانەو هەورییەکەیی سەری لادا، بوو بە باو، هەمووان وایان کرد، دوای شەست ساڵ لەم ڕووداوە، هیچ شتێک نەما بەناوی جلی نەتەوەیی.

خۆنەبوون، سەری لە قەلەڕەش شێواند، هەوری تواندەوە، نەتەوەیی بێ پێناسە هێشتەوە. هەندێ گۆڕانکاری‌و بەرەو پێشچوون، کارەساتە. خۆت بە، ئەگەر قەلەڕەشیت، دیارە سروشت پێویستی پێتە. جەنابت بەڕێز ئەستێرە، بەو بەرزییەوە هێشتا نازانیت، ئەستێرە بوون باشترە لە هەور بوون. خاتوونەکەم، نەتەوەو ڕێوڕەسمەکانی شتانێک نین بۆ گۆڕان. خۆت بە، جیهان پێویستی بە ئەنیشتاین‌و شکسپیرو ئەدیسۆنێکی تر نییە، ئەگەر پێویست بووایە نەدەمردن، باسی ناودارەکان ناکەین، تا ببین بە یەکێک لەوان، باسیان دەکەین تا سوود لە ئەزموونەکانیان وەربگرین. ببوورە ئەگەر خۆت نیت، نەبوونت باشترە، چونکە باخی یەکجۆر میوە، لەم سەردەمەدا بازاڕی نییە!



زانا عبدالرحمن

# به وشه ڕەقەکانتان، دڵە ناسکەکان مەشکێنن!

هەر کاتێك باسی دڵی ناسك دەکەم، وشە ڕەقو زبرەکانم بیردەکەوێتەوە، بە بیرکردنەوەم لە وشە ڕەقەکان، برینەکانی دڵ، زیاتر قووڵ دەبنەوە، هەمیشە هەوڵ دەدەم لەبیری بکەم، بەڵام وشەکان، هێندە وشەگەلێکی قورسن، لەبیرکردنیان گەلەك ئەستەمن.

زۆر جار قسەیەك ئەوەندە دڵمان دەشکێنێت، کە توانای هیچ وەڵامێکمان نییە، تەنها بەبێدەنگی تەماشای دەکەین.

هاوڕێی خۆشەویستم، ئەی ئەو هاوڕێ ئەزیزەی من، کە ئێستا ئەم گۆڤارە دەخوێنیتەوە، پەیامێکم بۆ تۆ هەیە؛ تکایە جوان گوێم لێبگرە، جوان لە وشەکانم ڕابمێنە، بەجوانی بیریان لێبکەرەوە، بزانە چیت پێ دەڵێم: (هەرکات ویستت قسەیەك بکەیت، تەنها وشەیەك بڵێیت، ئاگاداربە بزانە چی دەڵێیت، هەمیشە هەوڵ مەدە؛ وشەی قورسو توند(دڵشکێن) بەکار بهێنیت، چونکە دڵێکت شکان، هەرگیز ناتوانیت پارچەکانی کۆ بکەیتەوە، لە یەکیان بدەیتەوە، هەوڵیش مەدە بیکەیت، چونکە دڵ وەك شوشەوایە، ئەگەر بیشکێنیتو بتەوێت پارچەکانی لەیەك بدەیتەوە، ئەوا دەستت دەبڕێت)!

ئەگەر تۆ هەستت نییە، ئەوەی لە بەرامبەرتە هەستی هەیە، دڵی هەیە، بەڵام ئەگەر تۆ بە وشە زبرو ڕەقەکانت (کە وەك بەردێك وان، کەبی کێشیت بەنێوچەوانی کەسێکدا)، دڵی بشکێنیت بریندارى بکەیت، ناخی گرتێبەر بدەیت، ئەوا تۆ بەر پرسیاری لە هەر کارێکی ئەو لەشکستەکانی، لەوەی کە ئەو بە هۆی وشەکانی تۆوە لە ناخەوە بڕوخێت.

بۆیە تکایەکت لێدەکەم، تکایەکی هاوڕێیانە، تکایە بە وریاییەوە هەڵسوکەوت بکە، وشە ناسکەکان بەکار بهێنە، چونکە وشە ڕەقەکان، نەك تەنها دڵە ناسکەکان، بەڵکو دڵە ڕەقەکانی وەکو بەردیش دەهەژێنێت، ئەگەر هەرچەندە دڵڕەقیش بێت، وشە بەردئاساکانی تۆ، نێو دڵی دەشکێنێت، پارچە پارچەی دەکات، بەو هەموو دڵڕەقییەوە دەیگرێنێت.

پیرەمێردی شاعیر لە بەشێك لە شیعرە ئامۆژگاییەکانیدا پێمان دەڵێت:

زمانت ڕابێنە لەسەر قسەی حەق
بە ئەسەدەب، نەوەك بە شێوازی ڕەق
ئەو پارچە گۆشتەی لەناو دەمایە
کلیلی دەرگای خێرو بەڵایە
هەروەکو دەرگای خێر دەکاتەوە
سەری زۆر بەڵاش، هەڵدەداتەوە

بەڕاستی پیرەمێردی شاعیر، زۆر جوان وەسفمان بۆ دەکات، چونکە ئەم زمانەی تۆ بەدەستی خۆتە، دەتوانی وەك نموونەیەکی جوانی گوڵئاسا بەکاری بهێنیت، کە هەمووان خۆشیان بوێت، تۆش هەمووانت خۆشبووێت، دەتوانیت پێچەوانەی ئەمەش بەکاری بهێنیت، نموونەی چەکوش ئاسا، بەردئاسا، کەبەر هەر پەنجەرەیەك کەوت، بیشکێنێت!

بۆیە دوا ئامۆژگاریم دەڵێم: (زمانت بکە باخچەیەك گوڵ، باهەر قسەیەکت چەپکێك گوڵ بێت، وشەکانیشت ئەو گوڵە جوانو ناسکانەی بەهار بن، کە هەم ڕەنگێکی جوانی هەیەو هەم بۆنێکی خۆش).

گوڵان حەمەئەمین

بەشی یەکەم

# ئادابە کۆمەڵایەتییەکان



لە ژمارەکانی پێشوودا لە تەمەنی پێنج ساڵیدا، ئاماژەمان کرد بە گرنگیی پەروەردەی کۆمەڵایەتی، کە چۆن منداڵەکانمان پەروەردە بکەین، تا کاتێك تێکەڵ بە کۆمەڵگا دەبن، بزانن بە چ ئەتەکێتێك مامەڵە دەکەن.

لەم ژمارەیەشدا، کە باسمان لە پەروەردەی منداڵە لە دوای تەمەنی حەوت ساڵییەوە، چەند ئادابێکی کۆمەڵایەتیی گرنگو تایبەت بەو تەمەنە دەخەینە خزمەتی ئێوەی ئازیز، بەو هیوایەی هەمووان بتوانین نەوەکانمانی لەسەر پەروەردە بکەین.

**ئەتەکێتی خواردنو خواردنەوە:**

پێویستە لێ نەگەڕێین، منداڵ خۆی چۆنی ویست وابکات، بەڵکو فێری بکەین پێش نانخواردن دەستەکانی بشۆرێت، بەڵام تەنها وتی گرنگ نییە، هەموو دەزانین منداڵ هەرشتێکی پێ بوترێت، خێرا جێبەجێی ناکات، باشتر وایە خۆمان بچین لەگەڵیدا دەستمان بشۆین، بۆی ڕوون بکەینەوە ئەگەر دەستەکانمان نە شۆرین، میکرۆبی پێوەیە، میکرۆب بەچاو نابیندرێت، لەگەڵ خواردنەکان دەچێتە سکمانەوەو تووشی نەخۆشی دەبین.

کاتێك دەست دەکات بە خواردن، ناوی خودا بێنێتو بەدەستی ڕاستی بخوات، نەهێڵین یاری بە خواردن بکات، قەپ نەگرێت لەشتێكو داینێتەوە...

باشتروایە لە کاتی نانخواردندا، گفتوگۆیەکی هێمنانە بکرێت، بەڵام هەموو ئەمانە پێویستی بە وریایی هەیە، کاتێك پەروەرشیار هەوڵی فێرکردنی ئەم ئادابانە دەدات، بە وردی فێری بکات، بۆ نموونە فێری بکە گەرچی گفتوگۆ لە کاتی نانخواردندا کارێکی باشە، بەڵام نابێت کاتێك خواردن لە دەمیدایە، قسەبکات. فێر بکرێت چاوەڕێی کەسانی لە خۆی گەورەتر بکات، لە ئاستی خۆیەوە بخواتو بەردەستی زۆر پیس نەکات، لەدوای نانخواردن، بەردەستی خۆی کۆ بکاتەوە، سوپاسی خودا بکات، پاشان دەست خۆشی لە ئامادەکاری خوان بکات، دەستەکانی بشۆرێت.

زۆر جوانە منداڵەکانمان فێر بکەین کاتێك لەماڵێکین داوای خواردنی ئەو ماڵە نەکەن، جگە لەوەی پێشکەش دەکرێت، کاتێك خواردن، لە میوانیدا دانرا، بە ئەندازەی پێویست بخوات.

هیچ کات لای هاوڕێکانی باس نەکات، کە ئێمە چیمان خواردو چی دەخۆین، نەك هاوڕێکانی ئەو خواردنەیان نەبێت.

لە کاتی ئاو خواردنەوەدا، ناوی خودا بهێنێت بە سێ جار بخورێتەوە، هەناسەی نەکرێتە سەر پەرداخەکە، بەدانیشتنەوە بێت، هەموو ئەمانە، ڕوون بکرێتەوە بۆ منداڵ، منداڵ بە ئاسانی جێبەجێی دەکات، بۆ نموونە بۆی شی بکەرەوە بۆ دەبێت ئەم ئەتەکێتانە بەکاربهێنین: هەموو خواردنو خواردنەوەکان، پەروەردگار پێی بەخشیوین بۆیە دەبێت بەناوی ئەو، دەست پێبکەینو بە سوپاسی ئەو کۆتایی پێ بهێنین، بە جارێك بیخۆینەوە گەدەمان ئازاری دەگات، هەناسەکانی بکەینەسەر پیس دەبێت.

**چەند تێبینییەکی گرنگ:**

* خۆشەویستان چ دایکێك ڕازی دەبێت منداڵ لە نێوماڵدا چپسێك بخواتو کاغەزەکەی لە ژوورەکەدا فڕێ بدات!؟ یاخود توێکڵی میوە لە نێوماڵدا فڕێبدات!؟ ئەمانەو زۆرشتی تر، کە دایکان نایەنەوێت ماڵەکانیان پیس ببێت، بەڵام بەداخەوە چەندجار منداڵ دەبینین لە باڵەکۆنو پەنجەرەوە کاغەزی خواردن فڕێ دەدات، یا لە ڕێگاو کۆڵان، بەڵام ئەگەر هاتوو فێر کرا ئەوە هەرگیز لە هیچ شوێنو جێگایەك شت فڕێنادات، بەوەش ڕۆشنبیری پەروەرشیارەکەی دەردەکەوێت.

* زۆر جوانە منداڵ فێر بکرێت؛ چرووك نەبێت، فێری بکە دوو چکلێتی پێ بوو، دانەیەك بدات بە هاوڕێکەی.

* زۆر پارە خەرجکردن بۆ خواردن، ئەمەش هەڵەیەکی ترە، کە تەواوی ئەو خواردنانە ماددەی پارێزەریان تێدایە، کە هۆکاری سەرەکین بۆ تووشبوون بە نە خۆشیی شێرپەنجە.

# هەمووتەمەن، بۆ خۆشەویستی نەک تەنها ڕۆژێک، بۆ ناشیرینکردنی!

خۆشەویستی، ڕازی ژیانو لەزەتی ڕۆحو ڕۆحی وجودە، پەیامی گەردوونو پیرۆزترین بەهای بوونەوەرە..

گەر خۆشەویستی نەبا؛ ئاسمان بێ ڕەنگو خۆر بێ تیشکو زەوی بێ ئاوو گولزار، بێ گوڵو خونچەو بێ بولبول دەبوو!

خۆشەویستی، سەمفۆنیای ژیانە، هەناسەی بەردەوامبوونی ڕۆحەکانە، خۆشەویستی بێ ژیان دەبێ، بەڵام ژیان بێ خۆشەویستی نابێ.. دەکرێ مردوویەك، خۆشەویستی هەبێت بۆ زیندووەکان، چونکە مردوو ڕۆحی نامرێ، بەڵام بێ خۆشەویستی، زیندووەکان بە ڕۆحو لاشە مردوون!!

خۆشەویستی، هەرگیز کەوشەندار ناکرێ؛ نە شوێن، نە کات، نە تەمەن، نە بارودۆخ، ناتوانێ سنوور بۆ خۆشەویستی دیاری بکات!

بەڵام لە سەردەمێکدا، کە زۆربەی بەها گەورەکان، کاڵ بوونەتەوە.. خۆشەویستیش، زۆرترین کاڵبوونەوەی بەخۆوە بینیوە، کە ئەویش سنووردار کراوەو لە ساڵێکدا، ڕۆژێکی بۆ دیاری کراوە.. لەکاتێکدا هەموو تەمەنی مرۆڤەکان، بەشی خۆشەویستی ناکات!!!

ئەو کارەش، جگە لە ئاوازێکی نەشاز، چیدی نییە!

مرۆڤ بێ خۆشەویستی، ناتوانێت مرۆڤ بێت!

بەڵام دەبێت وەك مرۆڤ، خۆشەویستی ئەدا بکا. خۆشەویستی، ئەگەر لەسەر ڕێوڕەسمی شکۆداری خۆی ئەدا بکرێ، ڕێگایەکە؛ بۆ پاکبوونەوەی دەروونو ئاوێتەبوون لەگەڵ مەحبووبێکدا، کە هەرگیز ناتوانی، لێی دوور کەویتەوە!

ڕۆچوونە بە ناخی مرۆڤێك، کە لە ڕێگای ئەوەوە؛ هەموو دنیا دەبینی.. مرۆڤێك شەیدای ناخی دەبی، نەك ڕووکەشی!

بۆنی ڕاستگۆیی‌و متمانەو ئەوینو پاکییەکەی، مەستت دەکا؛ پێش بۆنی عەترەکەی!

دەگەی بە کەسێك، کە هەموو حەزو هیواو خەونەکانتی تەسلیم دەکەی.. ئەو کەسەش، لە ڕێگای فەیسبووکو ڤالانتاینو پەیوەندیی ئەهریمەنیی بەناوخۆشەویستییەوە پەیدا نابێ!!

بەڵکو بە عەقڵو ژیریو ڕۆشنبیریو گەڕانو ماندووبوون بەدوای مرۆڤدا، دەتوانی بگەی بە تەواوکەری ڕۆحو هاودەمی ژیانت!

با چیدی.. یاری بە گەورەترینو جوانترین بەهای ژیان نەکرێ!

با چیدی.. خۆشەویستی، نەکرێ بە داوو تەڵەو مرۆڤە ساویلکەکان، نەبنە قوربانی!!



ئەسکەندەر ڕەحیم

# کامیان بەنرخترە: دەرزی، یان مقەست؟!

بەرگدروویەکی دنیادیدە، ویستی بەشێوازێکی تایبەت، کوڕەزاکەی فێری پەندێکی هێجگار گەورە بکات. بەرگدرووەکە، لەسەروبەندی دروونی پۆشاکێکی نوێدا، مقەستە گرانبەهاکەی بەدەستەوە گرتو دەستی بەبڕینی پارچە کوتاڵێکی درێژ کردو کردی بە چەند پارچەیەکی بچووکەوە، بۆئەوەی دەست بکات بە دروونیانو پۆشاکێکی نوێیان لێ درووست بکات.

هەرکە لە بڕینی کوتاڵەکە بووەوە، مقەستە گرانبەهاکەی فڕێدایە سەر زەویو نزیك لە پێڵاوەکانی!

کوڕەزاکەشی، بەسەرسامییەوە، سەرنجی کارەکەی باپیرەی دەدا.. پاشان باپیرە، دەرزییەکەی هەڵگرتو دەستی کرد بە کۆکردنەوەی پارچە بڕاوەکان، تا پۆشاکێکی ناوازەو نوێیان لێ درووست بکات. هەرکە باپیرە، پێکەوە پارچەکانی بە دەرزییەکە دروویەوە، دەرزییەکەی چەقاند بە جەمەدانەکەی سەرییەوە.

کوڕەزاکەی حەزی زانینی زۆری بۆهێناو خۆی پێ ڕانەگیراو لە باپیرەی پرسی:

باپیرەگیان، ئەوە بۆچی مقەستە گرانبەهاکەت فڕێ دایە بەر پێت، کەچی دەزرییە هەرزانبەهاکەت هەڵگرتو چەقاندت بە جەمەدانییەکەی سەرتەوە؟!

باپیرەی بەرگدروو گوتی:

کوڕەزای شیرینم، ئەو کارەم لەبەرئەوە کرد، چونکە ئەوە مقەستەکە بوو؛ ئەو پارچە کوتاڵە گەورەو درێژەی بڕیو پارچە پارچەی کرد، بەڵام ئەوە دەرزییەکەبوو، ئەو پارچە لێکدابڕاوانەی کۆ کردەوەو کردنی بە پۆشاکێکی جوان!

ڕۆڵەی شیرینم، پێویستە ڕێزی ئەو کەسە لەسەر سەرت دانەنێیت، کە هەوڵی ناکۆکیو پەرتەوازەییو هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیو برایەتی دەدات.. پلەوپۆستە بەرزەکەی هەرچییەك بێت، دەبێت بە چاوی شکۆمەندییەوە لێی نەڕوانیت!

بەپێچەوانەشەوە، هەمیشە لەگەڵ ئەوانەدا بە، کە هەوڵی هاوکۆکیو پێکەوەبوونو تەباییو برایەتی دەدەن!

دڵو دینی بە جاریٚ لیٚ ستاندم نیو نیگای چاوی
بە تیریٚ دوو نیشانەی پێکەوە ئەو شۆخە پێکاوە
ئەگەرچی نامەویٚ، من تۆبە بشکێنم خودا چ بکەم
هەموو جار ڕوورەشی لای تۆم دەکا، ئەو پەرچەمە خاوە -سەید-

# گەیشتن بە تۆ

کەرمیانی

ئەگەر هەموو عومرم هەنگاوێك بێت، ئەوا بەرەو لای تۆ هەنگاو دەنێم، چ فەزڵێکی گەورەیە خودایە، کە دەتوانم هەزاران هەنگاو بنێم بۆ حزووری یار! خۆ من ئەگەر تاسەی گەیشتن بە دیوانی تۆ نەبیٚ، ناتوانم هەناسەیەکی عومرم بە ڕێکەم، شەوانە شەوبۆی هەناسەی تۆو میسکی دیدارت نەبیٚ، ناگەمە بەرەبەیانی ناڵەی ئەوینو گریانی سەحەرو پێشوازی ڕۆژێکی نوێم پیٚ ناکریٚ!

هیچ شتێك نییە، بمبەستێتەوە بەم ژیانەوە جگە لە تۆ، هیچ ناسنامەیەك نییە، شوناسی من بیٚ جگە لە تۆ، هیچ نیشتمانێك نییە تیا بسرەوم، جگە لە دڵی تۆ!

من بەو شەماڵە دەژیم لە مەملەکەتەکەی تۆوە هەڵدەکا

بەسەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دیٚ نەشئە، پەی دەر پەڕی
چ غەمزەی دیدە مەخمورێکە، ئەمشەو کون دەکا سینە -مەحوی-

لە هەموو شتێکدا تۆ دەبینم، لە هەموو هەنگاوێکمدا لەگەڵم دەژی، هەرچەندە من بۆلای تۆ دەچمو بۆ گەیشتن بە تۆ هەنگاو دەنێم، بەڵام تۆ لە خودی خۆم لێم نزیکتری!

هەستکردن بە وجودی تۆ، بەردەوامیم پیٚ دەبەخشیٚ، مانا دەبەخشیٚ بە ژیانم، بیٚ تۆ حیکمەتێك لە بوونی من نامێنیٚ، بیٚ تۆ ژیان جگە لە عەبەس چیدی نییە! جگە لە باوەشی تۆ،

ئەمانێك نییە بۆ ڕۆحم، ئەگەر جگە لە مەملەکەتەکەی تۆ، هەر شوێنێکی دیم پێ خۆشبێ، من هیچێ لە ئەوین نازانم!

فەرزەن هەموو دونیامنو عومری خزرم بوو
بێ جەننەتی ڕووی تۆ، چ حەیاتێکە، چ ژینە -وەفایی-

عومری خدرو جامی جەم بە چی، ئەگەر دووربم لە تۆ، من دەسووتێم بۆ گەیشتن بە جەننەتی ڕوخساری تۆ، سەرو ماڵم دەکەمە سەودای جەماڵی تۆ، بێ تۆ، من هیچم نییە ئەگەر شەوقی دیدارو تاسەی ڕۆژی لیقا نەبا، من لە پێناوی چیدا ڕۆژگاری ژیانم بەڕێ دەکرد؟ ئەگەر سالیکی ئەو تەریقەتە نەبام، ئێستا مەستو حەیرانی چی لاڕێیەك دەبووم؟!

ئەگەر شەوقی جەماڵی تۆ نەبێ، من مەستو حەیرانم!
لەبەرچی بۆتە بولبول گوڵ، چرا بۆ چ بۆتە پەروانە -وەفایی-

خۆ دەزانم گەیشتن بە تۆ ئاسان نییە، چما گەیشتن بە بەهەشتی ڕۆح، کەی ئاسان بووە!؟

ئەگەر ئێستا شەوانە گریان میوانی چاوەکانت بێو فرمێسك گوڵاو پرژێنی ڕومەتت بکاو ئاگر لە سینەت بڵێسە بدا، بەڵام تۆ سەودای نیشتمانێك دەکەی، کە ئیدی گوڵ تیایدا ناوەرێو دڵ تیایدا ناشکێو خەم وجودی نامێنێ! ئیدی تێر بە چاوانت لە ڕوخساری ئەوینداری خۆت دەڕوانی، ئیدی دووریو جودایيو تەنیایی دەبڕێتەوە!

بۆ ئەو ڕۆژە دەسووتێم، کە ئیدی بە زمانی پەپوولە دەدوێین، بە چاوی شەونم تەماشا دەکەین، بە لێوی گوڵ پێدەکەنین، بە دڵی بەفر ئەوینداری دەکەین!

من دەزانم بۆ گەیشتن بەو دەڤەرە، دەبێ قوربانی زۆر بدەم، من گوڵستانم دەوێ، بەڵام وەك مەولانای ڕۆمی دەڵێ: گوڵ لەسەر بەرد ناڕوێ، ببە بە خۆڵ، دەبیتە گوڵستان!

ببە بە خۆڵ، تا بگەیتە ژێر پێی، تا بگەیتە ئەو مەقامە بەرزە

غوڵامانە سەرم دانا لە بەرپێیا، وەکو زوڵفی
کەچی ئەو هەر منی خستۆتە پشتگوێ، وەك غوڵامانە!-مەحوی-

گلەیی ناکەم، خۆ هەموو کەس ناتوانێ بگاتە دیوانی شازادەی مەملەکەتی ئەوین!

خۆ هەموو خۆڵێك بۆ خاکی بەرپێی شایان نییە! دەبێ چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بکەین، خاکی ئێمە دەبێتە جێ نەقشی قەدەمی یار!!

خۆت دەزانی موددەتێکە سەیرو پامەڵی جەفام
کەی وەکو نەقشی قەدەم، لەسەر نێمە ژێر پێتەوە -وەفایی-

ئەو دەڤەری گوڵستانە، دڵی پاکو سینەی چاکو چاوی بە ئاوی عیشق شۆراوی دەوێ، مەستی بە هەستو شەمی سووتاوی دەوێ!

دەلیلی چاکو پاکی پێ دەوێ، وەسڵی ڕوخو زوڵفی
خودا شادی بە شانەی داو، سەفای جەننەت بە ئاوێنە -وەفایی-

هەمیشە دەمەوێ ببمە شایانی ئەوەی بتوانم بێمە حزوورت، بتوانم ئەو ڕێگایە بگرم، کە دەمگەیەنێ بە تۆ، بە بێدەنگی، ئازارەکان بنۆشم....!

گوێ لە قسەی کەس ناگرم، کەس نە منو نە ڕێگاو نە مەتڵەبی عومرم نابینێ! جگە لە سۆمای چاوی عاشق هیچ چاوێك جوانی نابینێ! هیچ چاوێك بە حەقیقەت ئاشنا نابێ! باسی سووتانی نیوەشەوو، سەودای عومرو بەخشینی ڕۆح، بۆ کێ بکەم؟!

بە تاری زوڵفو گوڵناری جەمالی تۆ بە ڕۆژو شەو
سەرم دەربەندی سەودایە، دڵم سەر گەرمی سووتانە -وەفایی-

کێ دەزانێ من بۆ دەسووتێمو بۆ کاتێ لە گوڵشەنی موحتەرەمت نزیك دەبمەوە گڕی هەناوم خەریکە دەمکا بە قەقنەس!

وانەی سووتانو گڕی ناخو قرچەی دڵ بۆکێ ئەدا بکەم!

مەنعی سووتانم دەکا ئەبمە، لە شەوقی تەلعەتت
چۆن ئەسووتێ ئاتەشی سوزان، کە گەییە نەوتەوە -نەدەب-

بۆ گەیشتن بە تۆ، هەموو دنیام وەلاناوە، نەبیر لە هیچ دەکەمەوەو نە دەمەوێت لە بیری کەسدابم!

دەزانم، گەیشتن بە تۆ، ڕێگایەکی درێژی دڕکڕێژی پڕمەترسیو پڕئاستەنگو شاخو داخو ئاخو ئاه و زۆرانبازی لەگەڵ مەرگە!

بەڵام ئەو کاتەی ئەویندار، هیچ نابینێ جگە لە ڕێگایەك، کە بە ئەوینداری دەگەیەنێ!

هەست بە ئازارێ ناکا، جگە لە ئازاری دووری، گوێ لە هیچ ناگرێ، جگە لە ئاوازی قافڵەی ئەوین! ڕازو نیازی خۆی بۆ کەس عەرز ناکا جگە لە ئەویندار! مەستی لیقایەکە، کە دەزانێ چی ڕوودەدا، گەر بێتو یاری دەرکەوێ جارێ!

هەناسەم دا بە ناڵە، عەرزی حاڵی کەم، کە تاساوە
لە خوێناوی دڵو جەرگم دەروونم کەیلە تا سینە
لە عالەمدا عەلامەی سوبحی حەشر ئیمشەو بەیانی دا
خودا عالم، لە چاکی ئەو بەرۆکە دەردەخا سینە.-مەحوی-

ئازیزم، بیزاعەم موزجاتە، وەك کوڕانی یاقوب، چیم هەیە تا قابیلی دیوانی یوسفینت بێ؟!

ئەگەر سەد ڕۆحو دڵ بێنم، موورادی من ڕەوا نابێ
لەبی لەعلی بە من نادا، دەزانێ ڕۆح، چ شیرینە -وەفایی-



# نامە نوریەکان

ئیلاهی لە شەوەزەنگی ئەم زەمەنە تاریکو ئەنگوستە چاوەدا، پەنام هێناوە بۆ تۆ، جگە لە نوری تۆ، ئیلاهی.. تروسکاییەك بەدی ناکەم!

کەسێك نییە جگە لە تۆ سکاڵای دڵمی لا بکەمو دەرمانی دەردی منی لابێ، جگە لە تۆ ئەی پەروەردگار، کێ هەیە لە دەرگای تۆی دابێو بۆی نەکرابێتەوە؟ کێ هەیە دەستی بۆ لای تۆ بڵند کردبێو نائومێدت کردبێ؟ کێ هەیە بە دڵی شکاوو فرمێسکی ڕژاوو هەنسکی بەکوڵەوە، کڕنووشی بردبێو بە بارانی میهری خۆت گوڵاو پڕژێنی دڵیت نەکردبێ؟

کەس هەیە جگە لە تۆ؛ پەنای بێپەنایانو هیوای بێهیوایانو ڕەجای ئاواتەخوازان بێ!؟ ئیلاهی ئەگەر من بەندەیەکی یاخی بم، خۆ هەر لەسەر زەوییەکەی تۆو لە ژێر سێبەری ئاسمانەکەی تۆدامو لە ڕزقو ڕۆزی تۆ دەخۆم!

خودایە من هەرچەندە خراپ بم، تۆ هەر خودای بەخشندەو میهرەبانی، ببەخشە بەندەیەك، کە بە دەستی خاڵیو ڕووی سیاو بارێ تاوانەوە هاتۆتە دەخالەتت!

هەژارو داماوو کەساسەکان، کێیان هەیە جگە لە تۆی دەوڵەمەند؟ لاوازو بێدەسەڵاتەکان، کێیان هەیە جگە لە تۆی بەهێزو بە توانا؟

کێ هەیە جگە لە تۆ هاوارو هەنسکی لێقەوماوان ببیسێ، کێ ئاگای لە ڤرچەی جەرگو ناڵەی دڵو کسپەی دەروونە، جگە لە تۆ؟

ئەوەی داوای لێ دەکرێ، خۆ هەر داوا لە تۆ دەکا! ئەوەی دەستی لێ پان دەکرێتەوە، هەر دەست لە تۆ پان دەکاتەوە! ئەوەی لێی دەترسین ناتوانێ لە تۆ نەترسێ!

ئەوەی وا دەزانین کاری مەی بەدەستە، خۆ هەموو کاروباری وا لە دەستی تۆدان!!

ئەوەی ئێمە هیوامان پێیەتی، خۆ تەنها هیوای هەر بە تۆیە!

خودایە شەرمەزارین، لە بری بێینە بەر دەرگای واڵات بە عیززەتەوە، بەرەو دەرگای بەندەکانت ڕادەکەین بە زیللەتەوە!!

کێ هەیە خۆی تەسلیمی تۆ کردبێو تۆش تەسلیمی دوژمنەکانیت کردبێ!؟

کێ هەیە داوای ڕزقو ڕۆزی لە تۆ کردبێو لەبرسا کوشتبێتت؟

ئەوەی بژی ڕزقی لەســەر تۆیەو ئەوەی بمرێ دێتەوە بۆ لای تۆ، خوداوەندا!

چەندت نیعمەت پێداینو نەمانتوانی شوکری بکەین!

چەندجار تاقیتکردینەوەو نەمانتوانی ئارام بگرین!!؟

چەندجار تاوانی ئێمەت بینیو داتپۆشینو ڕووڕەشت نەکردین؟!

ئێمــە خراپەمــان کردو تــۆش هەرلەســەر چاکــەی خۆت بەردەوامبووی لەگەڵمان!؟

خودایە کەسێك تۆ دەستی نەگریو هیدایەتی نەدەی، ڕێگەی چەندە ســەختو تاریکە! کەســێ تۆ نەبیتە هۆگری دڵی، چەند نامۆو تەنیاو بێکەسە!؟

ئــەی هەمیشــە نزیك لــە بەندەکانــت، ئەی خۆشەویســتی گوناهباران!

ئەی ئاسودەبەخشــی دڵی خوداویستان، پەنای بێپەناو کەسی بێکەسان، ئەی قبوڵبەخشی تۆبەکاران، ئەی لێبوردەی گوناهباران ئەی داپۆشەری عەیبوعار، خاوەنی لوتفی بێ شومار!

لــە بەرامبــەر میهرەبانیــت، تاوانــی خۆمــان لا بچوکە! لە بەرامبەر چاکەی تۆدا خراپەی خۆمان لا چروکە!

چەند شەرمەزاری دەرگاتین، هەزار ئەوەندە بەتەمای لوتفو کەرەمو خەڵاتین!

یەحیای کوڕی موعاز دەڵــێ: «إلهي؛ كيفَ أدعُوكَ وَقد عَصَيتُك، فَكيفَ لا أدعُوكَ وَقد عَرَفتُك!»

خودایــە شــەرمەزارم؛ چۆن لە ڕوومبێ لێــت بپاڕێمەوە، لە کاتێکا سەرپێچی فەرمانی تۆم کردووە؟

بەڵام دوای ئەوەی بە تۆی بەخشندەو میهرەبان ئاشنا بووەو دەزانم چەند بە بەزەییت، چۆن لێت نەپاڕێمەوە!

ئازیزم: هەموو لەزەتو خۆشییەکانی دونیا، مەتاعێکی کەمن، خۆشییەکی کاتین، جگە لە خۆشیو لەزەتی قوربی ئیلاهی!!

نزیکی لە خوداو هۆگربوون بە زیکری ئەوو پەیوەســتبوونو پشتبەســتن بە زاتی "الله"، لەزەتێکی ســەرمەدیو خۆشــییەکی نەبــڕاوەو بەختەوەرییەکی بێســنوورە، ئــەو هەنگاوانەی بۆلای خوداوەندت دەبەن، ئەگەر بەســەر دڕکو داڵو پشکۆی ئاگریشدا بێت، خۆشترین لەزەتی ڕۆحن!

ئــەو کاتەی مرۆڤ دەزانێ بۆ کوێ هەنگاو دەنێو بۆ لای کێ دەچێ! ئیدی ســەختی ڕێگاو نارەحەتی ئەو سەفەرە موقەدەسە، ناتوانن لەو خۆشیە مەحرومی بکەن!!

ئەی هاوار: شاهەنشــای گەورە، مەلیکولمولوك، دەرگای کردۆتە سەر پشت، بانگی بەندەکانی دەکا بە لوتفو مەرحەمەتی یا عبادی!!

بانگیان دەکا بۆ دەریای میهری بێسنووری خۆی، بۆ گەیشتن بەو دەوڵەمەندەی هەموو دەوڵەمەندان موحچەخۆری ئەون!

بەو دەسەڵاتدارەی هەموو دەســەڵاتداران خزمەتکاری ئەون!

بەو توانایەی، کە هەموو تواناداران غوڵامی ئەون!!

گەیشتن بە خودا؛ گەیشتنە بە دەڤەرێك، کە تیایدا خۆزگەو ئاواتەکان ســنووریان نییەو کەرەمو بەخشندەییو جودی ئیلاهی هەرگیز کۆتایی نایات!

گەیشــتن بە خودا، گەیشــتنە بە خاوەنی هێزێك، کە هەموو مەلەکوت لەبەردەســتیدا لە گەردیلەیــەك بچوکترن، هێزێك بە کافونونێك هەموو گەردوونت بۆ ژێرو ژوور دەکات!

بــەڵام کەی دەگەینە نێو دەڤەری ئەمانی ئیلاهیو دەســتمان دەگاتە حەبلی مەتینی کۆمەکی هێزی خوداوەند!

ئەو کاتەی چرپەی لێومان زیکری ئەوە، نیگای چاومان یادی ئەوە، ترپەی دڵمان فیکری ئەوە!

ڕازو نیازمان ویردی ئەوە! ژیانو مانمان وەقفی ئەوە، هەنگاو تەنها بۆلای ئەوە!

خۆ بۆ ئەو دەرازێنینەوە، تەنها لەو دەپاڕێینەوە! نمایشــمان هــەر بۆ ئــەوە، ئەم دنیایەمــان لا خەوە، گــەر قوربی خودامان هەبــێ، ئیدی چــی دەبێ، با ببــێ، دڵ جێگای ئەوینــی خوایە، تــرسو حوببی وی تێدایە، ترسو لەرزی لە کەس نییە، خەیاڵی لای بەنــدە نییە، کێ دەس دەخاتە کاری خــوا، دەتوانێ بەخودا بڵێ نا؟!

ئەوەی بە ڕاســت خوای ناســیبێ، بە چاوی دڵ ئەوی دیبێ، متمانەی بە هێزی خوا بێ، ترســی خوا، لە دڵیا ڕوابێ! مەحاڵە لە کەس بترسێ، بۆ هیچ کار لە کەس بپرسێ!

کەسێ دەرگای خودای دیبێ، لە دەرگای کەسی دی دەدا!؟

کەسێ خودای خۆی ناسیبێ، خۆی بۆ هیچ کەس زەلیل دەکا؟

کەســێ خودا خۆی بانگی کا، ڕوو لــە ڕووگەی هیچ کەس دەکا؟!

مەحاڵە دوای ناسینی خوا، حیساب بۆ بەندە قەت بکا!!!

ئازیــزی من، دەگێڕنــەوە کابرایەك دەیویســت لە ڕووبارێك بپەڕێتــەوە نەیدەوێــرا، لەو کاتــەدا عابدێکی خواناس لەســەر پارچە کاغەزێك شــتێکی نووسیو کردیە نێو باخەڵی کابراو پێی گوت: مەترســە، باوەڕت بە خــودای گــەورە، یارمەتیت دەدا بۆ پەڕینــەوە، بــەڵام وریابە! ئەگــەر باوەڕت بە خودا لە دەســتدا، دەخنکێــی! کابراش متمانــەی پێکردو لە نێــو ڕووبارەکەدا زۆر بــە ئاســانی هەنگاوی دەناو نزیك بوو لەوەی تــەواو بپەڕێتەوە، بەڵام زۆری حەزدەکرد بزانێ لە نێو کاغەزەکەدا چی نووســراوە! کاتێــك کاغەزەکەی کردەوە بینی نووســراوە «خودایە، یارمەتی ئــەم پیاوە بدە؛ بۆئەوەی لــەم ڕووبارە بپەڕێتەوە»، کابرا گوتی: هــەر ئەمە بــوو، جا ئەمە چییە! ئەم خودایە چۆن یارمەتی من دەدا!؟ لەو کاتەدا، کە گومان گەیشتە نێو دڵی، بەلادا هاتو کەوتە نێــو ئاوەکەو نوقم بــوو!! تا نامەیەکی دی بــە خودای گەورەت دەسپێرم.

ع.ش.شێرکۆ

# لەگەڵ زیوەری شاعیردا

سەد تاجری دین خۆی لە زەرەر داوە لە دەرتا
بەسراوە دڵی موئمینو کافر، لە کەمەرتا
سەودایی شەڕوشۆڕە، لەگەڵ ئێمە لەسەرتا
باکم نییە لەو خەنجەرە، کردووتە بە بەرتا
شمشێری بڕۆت، جەرگی بڕیوم بە ئیشارەت

زێوەر؛ ناوی عەبدوڵڵای کوڕی محەممەد ئەفەندی مەلا ڕەسوڵ پشدەرییە، لە ساڵی ١٨٧٥ی زایینی، لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی کانێسکان لەدایکبووە.

زێوەر؛ شاعیرێکی زاناو ڕۆشنبیرو کوردپەروەر بووە، وێڕای پلەی شاعیرێتی، هەموو تەمەنی لە پێناوی پەروەردەو فێرکردنی نەوەکانی کورددا بەسەر بردووە، بەدرێژایی ژیانی، مامۆستای مەعاریف بووە.

زێوەر لە بوارەکانی نیشتمانپەروەریو کۆمەڵایەتیو غەزەلدا، شیعری جوانو ناسکی هەنو مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی، بەرێزەوە ناویان هێناوە.

زێوەری شاعیر، لە ١٩٤٨/١١/١٠، لە شاری سلێمانی، دڵە گەورەکەی لە لێدان دەکەوێو کۆچی دوایی دەکا.

## صوبحی گوڵشەن

صوبحی گوڵشەن، کەی ئەگاتە، لەززەتی لەیلی ویصال
شەمعی مەجلیس، کەی بەرابەر بوو، لەگەڵ شەوقی جەمال
پرتەوی نووری جەبینت، لالەیی هەر مەجلیسە
شەوچرای بەزمی دلانی، بێیتە مەیدانی خەیاڵ
شاهراهی کۆیی تۆ، هەروەك طەریقی جەننەتە
هەرکەسێ ئەو ڕێگە بگرێ، هاتە سەر ڕێگەی کەماڵ
دەستی من ناگاتە داوێنت، لە ئەوجی عیززەتی
من گەدای بێنەوا، تۆ پادشای صاحیب جەلال
دەفعەیێ، سا شادمانم کە؛ بە وەعدەی وەصڵی خۆت
تابەکەی عومرم گوزەرکا، هەر لە ڕێی هیجرو مەلال

## کەسێ تەشبیهی باڵای تۆ..

کەسێ تەشبیهی باڵای تۆ، بەسەرووی نەونەمامی کرد
زمانی لازمە ببڕن، بڵێن تەرکی کەلامی کرد
لەبەردەم کەعبەیا، گەر مەنعە صەیادی، لەبەرچی بوو
لەبەر میحرابی ئەبرۆتا، دوو چاوت، قەتڵی عامی کرد!
بە مەدحی ڕوویو موویو قامەتی ڕێکت، زمان لاڵە
ئەگەرچی دڵ، بە پەنهانی خەیاڵێکی تەمامی کرد
ئەتۆی ڕۆژێ، کە پێت دانا لە خانەی سینەما، دڵ ڕۆی
عەجائیب قەدری میهمانی نەگرتو زوو قیامی کرد
مەڵێن: مورغی دڵت، بۆچی گرفتاری نیگارت بوو
بە غەممازیی هەزارێکی وەها، مەحبوسی دامی کرد
نیگاهێکی نەکردە قەلبی زارم، دولبەرم ئەمڕۆ
وەکو ئاهوو، وەکو تاووس، بە بەر چاوما خەرامی کرد
صەبا! گەر تۆ بە کۆی جانانە واصڵ بووی بڵێ: (زێوەر)
لە حەسرەت ئیشتیاقی تۆ، بەجارێ تەرکی کامی کرد